# کەرکوک لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا

## لەنێوان ساڵانی

## ١٨٧٦ – ١٩٠٩ی . ز


## گۆران ئیبراهیم ساڵەح



**بەهاری ٢٠٠٧**

---

مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن.ك)

سلێمانی ـ گەرەکی ئاشتی ـ ١٠٤

شەقامی ئاشتی ـ٣٢ ـ ١٠٣٢

ژ.خانوو ـ ٦٢

---

www.hoshyari.org

govarynovin@yahoo.com

# کەرکوك لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا


- بابـــەت: مێژوو
- نووسینی: گۆران ئیبراهیم ساڵەح
- نەخشەسازی: فەهمی جلال
- بەرگ: سۆران عەبدوڵڵا
- پیتچن: ئەرزە خالد
- خاڵبەندیو هەڵەبڕی: عەدنان کاکە ڕەش
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- ژمارەی زنجیرە: ( )
- ژمارەی سپاردن: (٦٠)ی ساڵی ٢٠٠٧
- چاپ: دەزگای چاپو پەخشی حەمدی

لەبڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی.ن.ك)

**پێشکەشە بە:**

* شەهید حاجی هەڵمەت و سەرجەم شەهیدانی ڕێگەی ڕزگاری کوردستان.

*دایک و باوک و خوشک و براکانم.

* سەرجەم ئەوکوردانەی شاری کەرکوک کە تا ئێستا لەسەر خاکی زێدوی باووبا پیری خۆیان بێلانەومانن.

# پێڕست

## بەشی سێیەم:

## ڕەوشی خوێندن‌و فەرهەنگی‌و ئابووری شاری کەرکوك



## ئەنجام



## لیستی سەرچاوەکان



## پاشکۆ

# پێشەکی

کاتێک ئێمە دێینە سەر باس و لێکۆڵینەوە لەقۆناغێک لەقۆناغە مێژووییەکانی شاری کەرکوک، ئەوا دێینە سەر باس لەیەکێک لەشارە گرنگ و مێژووییەکانی باشووری کوردستانی گەورە. کەرکوک لەمێژە بووە بە ناوەندێکی گەورەی ململانێی نێوان دەسەڵاتدارو زلهێزە هەرێمی و نێودەوڵەتییەکان، ئەمەش زیاتر بۆ گرنگی پێگەی ستراتیژی و ئابوری ئەم شارەو دەوروبەری گەڕاوەتەوە، لەسەرجەم قۆناغە مێژووییەکانی کۆن و نوێ و هاوچەرخدا.

ئەو هۆکارانەی کە وای لەئێمە کردووە هەستین بە ئەنجامدانی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەمەڕ شاری کەرکوک لەو قۆناغەدا، وەک حەزو ئارەزوویەک بووە ئینجا وەک ئەرکێکی نیشتمانی. ئەم قۆناغەی لێرەدا هەڵمان بژاردووە(١٨٧٦-١٩٠٩ز) یەکێکە لەو قۆناغە گرنگانەی ئەم شارە. کە دەیان لێکۆڵینەوە لەخۆدەگرێت

بەجۆرێك ئەو گۆڕانكارییانەی لەم قۆناغەی ئەو شارەدا ڕوویان داوە كە هەتا ئێستاش بەچەندین شێوازی جۆراوجۆر شوێنكاری خۆی بەسەر گەلێك لەلایەنەكانی ئەم شارەوە بەجێهێشتووە، بۆ نموونە بۆ یەكەم جارو لەگەڵ كۆمەڵێك گۆڕانكاری ئیداری ویلایەتی موسڵی تێدا دروست بوو، پاش دروست بوونی ویلایەتی موسڵ، دەوڵەتی عوسمانی چەندین جۆرو بەچەندین ڕێگا سیاسەتی خۆی بەسەر ئەم شارەدا سەپاندووە كە بەبەراورد لەگەڵ قۆناغەكانی پێش خۆیدا جیاواز بووە. ئەوكۆمەڵە ئامارانەی دانیشتوانی شاری كەركوك كەلەم قۆناغەدا كراون، زۆرینەیان بیانی و توركین كە جەخت لەسەر زۆرینەی كورد دەكەنەوە لەم شارەدا هەرلەم قۆناغەدا بۆیەكەم جار دەزگای چاپ دێتە كەركوكەوەو ڕەوتێكی ڕۆشنبیری و فەرهەنگی و خوێندەواری نوێ لەم شارەدا دەست پێ دەكات هەروەها ململانێی وڵاتانی ڕۆژئاواو زلهێزەكانی جیهان لەسەر ویلایەتی موسڵ بەگشتی و ئەم شارە بەتایبەتی، دروست دەبێت ئەو ماوەیەش كە دەست نیشانمان كردووە، ماوەی دەسەڵاتدارێتی و فەرمانڕەوایەتی (سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم)ە. لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانی كەلەساڵی(١٨٧٦-١٩٠٩ز) لەسەر حوكم بووە.

سەبارەت بەو ئاستەنگانەی هاتورتە پێشمان، گەڕان بەدوای سەرچاوە ڕەسەنەكاندا كەهەندێك جار نەمانتوانیوە وەدەستی بخەین و پشتمان بەهەندێك سەرچاوەی دیكە بەستووە. جیاوازی ڕاو بۆچوونی گەڕیدەو لێكۆڵیارو

سیاسییەکان لەسەر گەلێك لەلایەنە گرنگەکانی ئەم شارەو کاری وەرگێرانەکان و رێکخستنیان لەگەڵ یەکتری بەپێی ڕیزبەندی قۆناغە مێژوویەکان لەهەندێك شوێندا، کۆسپی بۆ دروست کردووین

سەبارەت بەناوەرۆکی ئەم لێکۆلینەوەیەش لە دەروازەیەك و سێ بەش پێکهاتووە، دەروازەکە باس لەشاری کەرکوك دەکات لەقۆناغە مێژووییەکاندا، هەر لەمێژووی کۆنی ئەم شارە، کاتێك پایتەختی گوتێکان بووە، تاوەکو هاتنی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بۆ باشوری کوردستان و ئەم شارەو یەکەم پێکدادانی دەسەڵاتی عوسمانی و ئێرانی لەم شارەدا. سەبارەت بە بەشەکانیش:-

بەشی یەکەم: چەمك و زاراوەو شوێنی جوگرافی کەرکوك.
ئەم بەشەش لەسێ باسی سەرەکی پێکهاتووە، لەباسی یەکەمدا، لەچەمك و زاراوەو ڕەچەڵەکی ناوی کەرکوك دەدوێن.
باسی دووەم: زیاتر جەخت لەسەر پێناسەی کەرکوك دەکەینەوە لە ئینسایکلۆپیدیای بیانی و ئیسلامیدا.
باسی سێیەم: سنوری جوگرافیەو لەدوولق پێکهاتووە:
ا-سنوری جوگرافی کەرکوك:
ب-سنوری جوگرافی کوردستان:
لەم باسەدا زیاتر هەوڵی دەستنیشان کردنی سنوری جوگرافی کەرکوکمان داوە لەسنوری جوگرافی کوردستاندا

بەپشتبەستن بەراوبۆچوونی چەندین سیاسەتمەدارو لێکۆڵیارو جوگرافی ناسی بیانی و عەرەب و کورد.

بەشی دووەم: باس لە سیستمی ئیداری دەوڵەتی عوسمانی دەکات لە کەرکوکدا، کە ئەم بەشەش سێ باسی سەرەکی لەخۆدەگرێت.

لەباسی یەکەمدا: هەوڵ دەدەین گۆڕانی سیستمی ئیداری دەوڵەتی عوسمانی و دروست بوونی ویلایەتی موسڵ لەسالی (١٨٧٩)ن داو پێگەو بارودۆخی شاری کەرکوك لەوقۆناغەدا ڕوون بکەینەوە.

لەباسی دووەمدا: تیشك خراوەتە سەر ڕێژەو ژمارەی دانیشتوانی کەرکوك لەسەرچاوە بیانی و تورکییەکان و ڕوونکردنەوەیەك لەسەر ڕەوشی کۆمەلآیەتی شارەکە.

لەباسی سێیەمدا: سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی لە شاری کەرکوك و ڕەوشی سیاسی شار هەڵ دەسەنگێنین.

بەشی سێیەم: ڕەوشی خوێندن و فەرهەنگی و ئابوری شاری کەرکوك لەو قۆناغەدا خراوەتە ڕوو کە ئەم بەشەش دابەش کراوە بۆسێ باسی سەرەکی ئەوانیش:-

باسی یەکەم: ڕەوشی خوێندن و فەرهەنگی و بارودرخی خوێندنگاو قوتابخانەکان و ناوەندەکانی خوێندنی شاری کەرکوکی تێدا ڕوون کراوەتەوە.

باسی دووەم: تایبەتە بە ڕەوشی ئابوری شاری کەرکوك، لەم باسەشماندا زیاتر هەوڵ دەدەین باس لە ڕەوشی ئابوری و کشتوکاڵ و بازرگانی و پیشەدەستییەکانی شارو ژیان و بژێوی

خـەڵکی و کـارو کاسـبی و ناوەنـدەکانی کـارکردن لـەبازاڕەکانی کەرکوکدا بکەین.

باسی سێیەم: هەوڵ دەدەین باس لەدۆزینـەوەی نـەوت لـە کەرکوکدا بکەین، پاشان هەوڵەکانی وڵاتانی ڕۆژئاواو هەڵوێستی دەوڵەتی عوسمانی لەومەیدانەدا.

دەربـارەی ئـەو سەرچـاوانەی سـودیان لێ بینـراوە، هـەوڵ دراوە بەچوار زمـان سەرچاوە بـەکاربهێنرێت زمانـەکانی کوردی، عـــەرەبی، ئینگلیـــزی و تـــورکی. لـــەنێو ئـــەم سەرچاوانەشـــدا سەرچاوەی دیکە هەیە کە بەپلەی یەکەم سودی لێ بینـراوە. لە لێکۆڵینەوەکەدا کە دەتوانین ئەمانیش بەپێی زمانەکان و بەشەکان پۆلێن بکەین:

یەکەم: ئەوسەرچاوە کوردییانەی بەشێوەیەکی سەرەکی سودیان لێ بینراوە(کامەران ئەحمەد: کوردستان لەنێو ململانێی نێودەوڵـەتی و ناوچەیدا) بەتایبـەتی لـە باسـی سـێیەمی بەشـی سـێیەمدا. (کوردســتان لەچـاپکراوەکانی عوسمانیـدا فەیـسەڵ دەبـاغ لـەتورکی عوسمانییـەوە کردویـەتی بـەکوردی)کـە لەبەشـی دووەم و بەشـــی سێیەمیـــشدا تـــوانراوە ســـودی لێ وەربگیرێـــت، بەتایبەتی بۆڕەوشی ئابوری شاری کەرکوک (محمد سعید سۆفی: پارێزگای کەرکوك لەناو پاکتـاوی ڕەگەزیدا) زیـاتر هـەوڵمان داوە لەباســـــی ســـــــێیەمی بەشـــــی دووەمـــــدا ســـــودی لێ وەربگـــرین،(س.ج.ئـــەدمۆنز: کـــورد تـــورك عـــەرەب) ئـــەم سەرچاوەیەش لە دەروازەو باسی دووەمی بەشی دووەمدا سودی لێ بینـراوە.(نـوری حەیـدەر هەمەوەنـدی: مێـژووی شـاراوەی

هەمەوەنـد). لەباسـی سـێیەمی بەشـی دووەمـدا زیـاتر بـەکار هێنراوە.

سـەبارەت بەسەرچـاوە عەرەبییـەکانیش(د.جمـال رشـید: کرکـوك في عـصورالقدیمة) لـەدەروازەو باسـی یەکـەمی بەشـی یەکەمدا سودی زۆری لیّ بینراوە. (د.کمال مظهر احمد: کرکوك وتوابعها حکم التأریخ والضمیر) لەدەروازەو باسی یەکەمی بەشی یەکـەم، باسـی یەکـەمی بەشـی دووەمو باسـی یەکـەمی بەشـی سـێیەمدا سـودی لیّ بینـراوە، واتــە لەهەرسـێ بەشەکەدا.(عبدالرزاق الحسنی: العراق قدیماً وحدیثاً) زیاتر لە دەروازەو باسـی یەکـەمو باسـی سـێیەمی بەشـی یەکەمـدا بەکارهێنراوە. (محمد هادی دفتروعبدالله حسن: العراق الشمالی) لەباسی سێیەمی بەشی یەکەمداو لە باسی یەکـەمی بەشـی سێیەمدا توانراوە سودی لیّ ببینرێت.(کامران عبدالصمد احمد دوستکی: کوردستان العثمانیة) لەباسی دووەمی بەشی سێیەمو باسی یەکـەمی بەشـی دووەمـدا سـودی لیّ بینـراوە(مجموعة من الاکادمین العراقیین: کرکوك مدینة القومیات المتأخیە) لەباسی یەکەمی بەشی یەکەمو لەباسی دووەمی بەشی دووەمو لەباسی یەکەمی بەشی سێیەمو لەباسی دووەمی بەشی سێیەمدا سودی لیّ بینراوە.

سـەبارەت بەسەرچـاوە تورکییـەکانیش بەشـێوەیەکی سـەرەکی تـوانراوە سـودێکی گـەورە لـە(شمـس الـدین سـامی: قاموس ئیعلام) ببینرێت. لەکاتێکدا (شمس الدین سامی) خۆی لەوکاتەدا ژیاوەو شاری کەرکوکی بینیوەو زۆر بەوردی لەبارەی

گەلێك لەلایەنەكانی شاری كەركوكەوە زانیاری وردی تۆمار كردووە، توانراوە لە باسی دووەمی بەشی یەكەمو باسی دووەمی بەشی دووەمو باسی دووەمی بەشی سێیەمدا سودی لێ ببینرێت واتە لەهەرسی بەشەكەدا.

سەبارەت بەگۆڤارەكانیش بەپلەی یەكەم سودێكی گەورە لە زنجیرە ژمارەكانی گۆڤاری كەركوك بینراوە كە چەندین لێكۆڵینەوەی زانستی لە سەرجەم بوارە جیاجیاكانی شاری كەركوك لەخۆ دەگرێت لەقۆناغە مێژووییەكاندا پاشان گۆڤاری (بانە ڕۆژ) كەسود لەچەندین ژمارەی وەرگیراوە بەپلەی سێیەمیش گۆڤاری (سەنتەری برایەتی)، بەتایبەتی ژمارەكانی(٢٣،٢٠) توانراوە سودێكی گەورەیان لێ ببینرێت. بەتایبەتی ژمارە(٢٠) كە تەرخان كراوە بۆ چەندین لێكۆڵینەوەی جیاوازی هەمەلایەنە لەمەڕ شاری كەركوك هەروەها گۆڤاری (نەوشەفەق).

لەكۆتایدا دەتوانین بڵێین كە ئەم لێكۆڵینەوەیە نەك بێ كەموكوڕی نییە، بەڵكو چەندین كەموكوڕی لەخۆدەگرێت، بەڵام بەپێی ئەو توانا كەمو سنوردارەی كە هەمانە توانیومانە هەر ئەوەندە بەئەنجام بگەیەنین. هیواداریین توانیبێتمان خزمەتێكی بچوك بە مێژووی ئەوشارە بكەین لەقۆناغێك لەقۆناغە مێژووییەكاندا.

# دەروازە

## کەرکوك لەقۆناغە مێژووییەکاندا

کەرکوك یەکێکە لەشارە کۆنەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، هەر لەکۆنەوە ناوەندێکی بازرگانی گرنگ بووە. ئەگەرچی زۆر بۆچوون و بیروڕای جیاواز لەبارەی مێژووی دروستبوونی شارو قەڵاکەیەوە هەن، بەڵام زۆربەی زانیارییەکان دەری دەخەن کە قەڵای کەرکوك لەنێوان ساڵانی(٤٥٠٠-٢٥٠٠پ.ز) دروست کراوە[١]. لەدەقە دۆزراوەکانی نوزی*(گاسوری کۆن) ئاماژەیەکی

---

[١] شۆڕش حاجی: تەعریبی کەرکوك، چاپخانەی شڤان، سلێمانی-٢٠٠٤، ل ل ٢٧-٢٨.

* نوزی دەکەوێتە باشوری خۆرئاوای کەرکوکی ئێستا بەدوری ١٣کم، ٣کم لەگوندی(ترکەڵانەوە) دورە، لەهەزارەی سێیەمی پ.ز دا بەگاسور ناسراوە،

ڕوون دەدرێت بەوەی کە گۆتیکان یان (گوتی)یەکان یەکێك لەدانیشتوانە کۆنەکانی کەرکوکی ئێستاو هەرێمەکانی دەوروبەری بوون[1]. گوتیکان لقێکن لەو دانیشتوانە کۆنەی کوردستان، کە ڕۆڵێکی گرنگیان لەبونیادنانی شاری کەرکوکدا هەبووە[2] لە هەرێمەکانی باشوری دەشتی شارەزوور** ژیاون لەو ناوچانەی کەوتونەتە نێوان زێی بچوك و ڕووباری

---

ئێستا بە(یۆرغان تەپە)، پاشماوەکانی شاری نوزی لەژێر گردێکی ٢٠٠×٢٠٠م دایە کەنزیکەی ٣٣٠م لەئاستی دەریاو ١٥م لەئاستی دەوروبەرەکەی بەرزە(کامەران محمد جلال: نوزی لەهەزارەی دووەمی پێش زایندا،(توێژینەوەیەکی مێژوویی سیاسی ئابوریە)،نامەی ماستەر، زانکۆی سلێمانی، ٢٧٠٤ کوردی/ ٢٠٠٤ز،ل١٥).

[1] د.جمال رشيد: كركوك في عصور القديمه، طبعة الأولى،مطبعة آراس، اربيل-٢٠٠٢،ص ٥٧.

[2] وەرگیراوە لە فاتیح عەبدوڵا: پارێزگای کەرکوك، چ.یەکەم،چاپخانەی ڕامان، سلێمانی-٢٠٠٥، ل١٢.

** وشەی شارەزوور لەسەرچاوە سریانییەکاندا لەنێوان سالآنی(٥٤٤-٦٠٥ز) بەشێوەی(سیرزۆر-سیارزوور) هاتووە، سریانییەکان ئەودەمەش وەریانگێڕاوەتە سەر(شەر زۆر)، لەکارنامەی ئەردەشێری پاپەکانیشدا بەشێوەی(سیازوورون یان سیارزوور) هاتووە، (هیراکلیوسیش) بەشێوەی(سیازوورون یان سیاسۆزۆن) ناوی بردووە، د.جمال رشیدیش دەڵێ هەموو ئەم ناوانە واتای دەرەختی ترێی سپی چڕدەگەیەنێ.(وەرگیراوە لە هاشم عاسی کاکەیی: شارەزوور لەڕوانگەی سێ بابەتی مێژوویدا،گۆڤاری کەرکوك(گۆڤارێکی ڕوناکبیری گشتی وەرزییە- کۆمەڵەی ڕوناکبیری و کۆمەلآیەتی پارێزگای کەرکوك دەریدەکات)، ژمارە(٢٢-٢٣) پایزو زستانی٢٠٠٤-٢٠٠٥، ل١٤٧).

سیروان و(ئارابخا) کەرکوکی ئێستا پایتەختیان بووە[1] بەپێی بەڵگە شوێنەوارناسی و مێژوویییەکان. پاشماوە کۆنەکانی شاری(ئارابخا)، لەباکوری خۆرهەڵاتی شارەکەدا، دەکەوێتە ژێر کەلاوەکانی قەڵای کەرکوکی ئێستا.[2] لەسەرەتای سەدەی(بیست وچوارەمی) بەر لەزاین،(شانشینی گوتیان)* وەك دەوڵەت و دەسەلاتێکی بەهێز لەمێژووی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی کۆن سەری هەڵداو دەرکەوت، ئەوکات لەلایەن سۆمەرییەکان بەوە دەناسرا کە شانشینێکی سەربەخۆیەو پایەی لەهەردوو شانشینەکەی(سۆبارتۆ) و(ئیلام) کەمتر نییە.[3] فەرمانڕەوایەتی

---

[1] د.جمال رشیدو فوزي رشید: تأريخ الكرد القديم،طبعة الاولى، اربيل- ١٩٩٠،ص٣٥

[2] کامەران محەمەد جەلال: نوزی لەهەزارەی دووەمی پێش زاین. ل١٩-٢٠

* گوتێکان دوای بالأدەستبوونیان ئیلامیان داگیرکرد، لەشاری(سوس)ەوە هێرشیان کردووەتە سەر بابل و دەستیان بەسەر سۆمەریشدا گرتووە، جەنگ و شاڵاوەکانی گوتی و لۆلۆ تاوەکو دەڤەری هاڵمان- سەرپێڵ زەهاو گەیشتووە. لەسەردەمی نارامسینیشدا گوندەکانی گوتی دەسوتێنرێ، گوتێکان دەگوێزنەوە بۆ ئارابخا(کەرکوکی ئێستا). پاشان لەتەك لۆلۆییەکان خۆی- -کۆدەکاتەوە و بەسەرکردایەتی پادشای گوتی(شرلك) ئەکەد دەشکێنن و لەوڵاتی سوبارتۆ دەریان ئەکەن.(کەریم زەند: کوردستانی پەرتکراو، چ.یەکەم. سلێمانی-٢٠٠٢، ل ٦٠ -٦١).

[3] وەرگیراوە لە د.ج.گەرمیانی: کەرکوك شاری مێژوو سەربەرزی کوردان، گۆڤاری سەنتەری برایەتی(گۆڤارێکی زانستی وەرزییە...گرنگیبەلێکۆڵینەوەی ستراتیژی و داهێنانی فکری دەدات) ،ژمارە(٢٠)، هاوینی ٢٠٠١.ل ٢١٦-٢١٧.

گوتێکان لەبەشی باشوری دۆڵی نێوان دوو ڕووبارو هەرێمەکانی کوردستانی باشوری ئێستاو بەتایبەتی لەشاری ئارابخا( کەرکوك)و هەرێمەکانی دەوروبەری بووە.[1]

یەکەمین ئاماژە کە لەنوسراوەکانی پادشای سۆمەرییەکاندا هاتووە، ئەوەیە کە لەهەردوو هەزارەی سێیەم و دووەمی پێش زایندا، خەڵکانێك لەباکوری خۆرئاوای (لۆلۆییەکان) ژیاون و بە(گوتێکان) ناسراون، ئەمەش بەواتای ئەوەی گوتێکان خەڵکانی کۆنی کوردستان بوون و هاوسێی کۆمەڵانی کوردستانی کۆن بوون کە بە(سوبی و لۆلۆیی و کاشی و میتانی) ناسراون، بەم پێیە گوتێکان دەبنە ئەو کۆمەڵەی کەشاری ئارابخا بونیاد دەنێن، ئەم شارە وەك پایتەختێکی کوردستانی کۆن لەهەزارەی سێیەمی پێش زایندا ڕۆڵێکی گەورەو گرنگی گێڕاوە لەڕاستکردنەوەی تەرازوی هێزەکان لەدۆڵی نێوان دوو ڕووبارو دەوڵەتانی سۆمەری و ئەکەدی و بابلیداو سەربەخۆیی سیاسی خۆیشی لەنێوانیاندا پاراستووە بەمجۆرە. دەسەڵاتی گوتێکان لەدۆڵی نێوان دووڕووبارو بەدرێژای ساڵەکانی(٢٢٣٠-٢١٢٠پ.ن) درێژەی کێشاو ئەو ڕاستییەشی سەلماند کە ڕۆژگارێك شاری ئارابخا(کەرکوکی ئێستا) ناوەندێکی گەورەی دۆڵی نێوان دووڕووبار بووە. بۆماوەی نزیکەی١١٠ساڵ تاکە زلهێزی ناوچەکە بوون و دەسەڵاتی خۆیان بەسەر ناوچەو دانیشتوانی

---

[1] رافدە عبدالله قەرەداغی: الگوتیون سکان الکردستان القدیمە..من هم..واین عاشو، گۆڤاری هەزارمێرد(گۆڤارێکی زانستییە لە شوێنەوارو مێژووی کوردستان دەدوێت و وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان دەریدەکات)، ژمارە(١١) ساڵی سێیەم، ئاداری-٢٠٠٠، ل١٥٩.

دۆڵی نێوان دوو ڕووباردا سەپاندووە، تادواجار لەهەڵگەڕانەوەیەکی کتوپڕی سۆمەرییەکاندا* لەساڵی(٢١٢٠پ.ن)دا بەسەرکردایەتی پادشای

---

* لەسەرهەڵدانەوەی سۆمەری نوێدا سەبارەت بەگوتێکان کە ئیمپراتۆریەتی ئەکەدیان ڕووخاند، فەرمانڕەوایی هەموو میسۆپۆتامیایان کرد، بۆماوەی سەدەیەك بەڵام زۆر زانیاری هەیە نازانرێت، لیستی پادشای سۆمەرییەکان ناوی(٢١)سەرکردەی گوتی- دێنێت کە وەکو پادشا حوکمیان کردووە. بەڵام تەنها پێنجیان نوسینیان بەجێهێشتووە. هەرلەم بارەشەوە ئاماژە بە نالەبارییەکی سیاسی و خامۆش بونێکی ژیاری(شارستانی) ئەکرێت، کە ئەم داگیرکەرانە ئەکەدیان ڕووخاندوو هەموو وڵاتەکەیان داگیرکرد. بەڵام لەگەڵئەوەشدا هێندێك لەشارە دەوڵەتییەکان لەئازادییەکی تەواودا ژیانو هەستی نیشتمانی بەهێزیان هەبووە، لەڕاستیدا بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی لە سۆمەروئەکەد سەری هەڵدا. کاتێك لەنزیکەی٢١٢٠-پ.ن) (ئۆتۆحیکال)ی پادشای(ئوروك) سەرکردایەتی سوپایەکی کرد. بێگانە ناحەزەکان تێکشکان و(تریکان)ی پادشاکەیان هەوڵی راکردنیدا دا. بەڵام گیراو هەموو وڵاتی سۆمەر کەوتە ژێردەستی(ئۆتۆحیکال). سۆمەر ڕزگاری بوو لە گوتیکان و(نوفەر) بوژایەوە، شاری(وەرکاء) ئەوشارەی لەسەردەمی گلگامێشەوە زیاتر لەچوار بنەماڵە حوکمی کردووە. بۆجارێکی تر سەرکردایەتی شارە دەوڵەتەکانی سۆمەری کرد، بەڵام ئەم بنەماڵەی پێنجەمە تەمەنی کورت بوو. تەنها حەوت ساڵ بەردەوام بوو.(ئۆتۆحیکال)یش لەسەردەستی یەکێك لەکاربەدەستەکانی خۆی بەناوی(ئورنمو) کۆتایی بەدەسەڵاتی هێنرا(٢١١٣-٢٠٠٦پ.ن).
(Gorg Allen: Ancient Iraq, Ruskin House, Museum Street p360-361)

سۆمەری(ئۆتۆحیکال) کۆتایی بەدەسەڵاتی گوتێکان هێناو فەرمانڕەوایەتیان لەهەرێمەکەدا نەما[1].

ئەم شارە لەسەردەمی دەوڵەتی ئاشوریدا، تاڕادەیەک گەشەی بەخۆوە بینی.[1] لەسەر ئەوبنەمایەی(شمشی ئەدەدی یەکەم)ی پادشای ئاشوری(١٨٧٠-١٨١٢پ.ز) لەپاش بەجێهێشتنی هەرێمی(ئۆربلیۆم) چووەتە نێو سنوری ئارابخاو لەناوەندی شارەکەدا هێندێک نمونەی(رەمز)ی بۆ پەرست داناو، نازناوی مەلیکی پێدان بەناوی خواوەند(ئەدەد)[2] ناوی ئەم شارەش لەمیانەی ئەو بەسەرهاتە مێژووییانەی بەسەریدا تێپەڕبوون بەرلە٢٧ سەدە پێش زاین ناوی هاتووە، کە هێندێک ڕا پێیان وایە پادشای ئاشوری،(ئاشوربانیپاڵ) دایمەزراندووە[3]. هەر لەم بارەیەوە(عبدالرزاق الحسنی) دەڵێت: ناوی کەرکوک لەدوو پەڕاوی کۆنی کلدانیەکاندا، بەم شێوەیە هاتووە، کە یەکەم پەڕاویان بریتییە لەپەڕاوی(مطران ئەدیشیر) ساڵی (١٨٩٦ی.ز) گۆڕدراوەتە سەر زمانی تورکی و بێ ئەوەی ناوی دانەرەکەی هێنابێ، ئەم پەڕاوە هەربەدەستنوس لەکەنیسەی کلدانیەکاندا

---

[1] کەیوان ئازاد ئەنوەر: کەرکوک لەمێژووی کۆندا، گۆڤاری کەرکوک، ژمارە(٢-٣) ی پایزی-١٩٩٩ ل ٧٠-٧١-٧٢.

[1] احمد رشید احمد بیبانی: کرکوک الجریحە، طبعة الاولی،مطبعة وزارة الثقافة، سلیمانیة،٢٠٠٤، ص٧.

[2] د.جمال رشید: کرکوك في عصور القدیمة، ص٣٥.

[3] وەرگیراوە لە وەلید شەریکە: کەرکوک توێژینەوەیەکی جیۆ-مێژوویی،گۆڤاری سەنتەری برایەتی. ژمارە(٢٠)هاوینی-٢٠٠١. ل١٥٦.

لەقەڵای کەرکوکدا ماوەتەوەو لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوارەوە پارێزراوە. پەڕاوی دووەمیش بریتییە لە(هەواڵی شەهیدەکانی خواناسان-اخبار الشهداو والقدیسین) کەلە (لایبزك-Laibizk) لە ئەڵمانیا(پۆڵس بێجان) لەحەوت بەرگی قەشەنگدا بەچاپ گەیاندوە. ناوی کەرکوك لەبەرگی دووەمیاندا هاتووە کە لە ساڵی (١٨٩١ن) دا چاپ کراوە لەلاپەڕەکانی (٥٠٧و٥٢٥)دا لەلایەك پەڕاوەکەی دیکەیش ئاماژەیان بەوەکردووە، کە ئەم شارە لەلایەن پاشای ئاشوری(ئاشور پانیپاڵ)ەوە دروست کراوە[1] بەڵام شوێنەوارو نەقە شوێنەوارییەکان، یەکێکن لەو بەڵگانەی مێژوونوسەکان پشتێکی گەورەی پێ دەبەستن. هەرلەم میانەشدا، لە ئاکامی لێکۆڵینەوە لە(٥) لەوحەی شاری کەرکوك و(٢) لەوحەی(یۆرغان تەپە-نوزی) کە لە گۆڤاری(ئاشورناسی و شوێنەوارناسی رۆژهەڵاتی) لەساڵی (١٩٢٦ن) بەقەڵەمی(س.ج.گد) بلاوبووەتەوە، نوسەر بەلێکۆڵینەوە لەسەر ئەو لەوحانە توانی بڵێ شاری کەرکوك، لەو سەردەمەدا جێگای باس بوو. شاری کۆنی(ئورفە)و(عەتیە خراپەسی) شارێك بووە، زۆربەی ناوە تایبەتییەکانی نەبابلی بوون و نە ئاشوری، ئەم داب و شوێنانەی لەپەیمان و دادنامەکاندا باس کراون زۆرینەی بەردە نوسراوەکان دەگرنەوەو پەنجە بۆ بوونی کۆمەڵێك رادەکێشن تەواو لەگەڵ خەڵکی وڵاتانی

---

[1] العراق قديماً و حديثاً، طبعة الثالثة، مطبعة عرفان،صيدا-١٩٥٨،ص٢١٧-٢١٨.

دەوروبەری جیاواز بوون.[٢] لێرەدا دەتوانین بگەینە ئەو ڕاستییەی کە ئاشورییەکان بونیادی شاری ئارابخایان نەناوە، بەڵکو پێدەچێت لەئاکامی ئەو ململانێیانەی لەنێو زلهێزەکانی ئەو سەردەمەدا هەبووە لەئاشوری و سۆمەری و میدی کاولکاری بەسەر ئەم شارەدا هاتبێت. کاتێکیش دەسەڵاتی ئاشورییەکان گەیشتووەتە ئەم شارە، هەستابێتن بەبونیاد نانەوەو نوێ کردنەوەی هێندێك لەبەشە کاولبووەکانی شارو دانانی ژمارەیەك نیشانەی دەسەڵات بۆخۆیان هەروەك لە هەندێك لە ناوچەکانی کوردستاندا دەبینرێت.

کەرکوك لەدوای ڕووخانی نەینەوا لەسەردەستی ئاشورییەکان لەساڵی(٦١٢پ.ز)دا، میدیەکان لەرۆژهەڵاتەوەو بابلییەکانیش لەباشورەوە هێرشیان بۆ هێناو داگیریان کرد.[١] لەئاکامدا سەرجەم ئەو هەرێمانەی کە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی دیجلەو باکوری(بەغدای ئێستا)وە کەوتە نێو سنوری دەسەڵاتی میدیەکانەوە، کەرکوك و هەولێروهەرێمەکانی سەر بەوانیشی دەگرتەوە[٢] پاش ڕووخانی دەوڵەتی میدی لەساڵی(٥٥٠-

---

[٢] س.ج.ئەدمۆنز: کورد تورك عەرەب.و. لەعەرەبییەوە حامیدی گەوهەری، چاپی دووەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر-٢٠٠٤، ل٣٥٠.

[١] وەرگیراوە لە روفانیل میناس: کەرکوك لەمێژوودا.و. هیوا صالح، گۆڤاری. ئاران، ژمارە(١٣) ساڵی ٢٠٠٠، ل٤.

[٢] د.کمال مظهر احمد: کرکوك وتوابعها حکم التاریخ والضمیر،(دراسة وثائقية عن القضية الكردية في العراق)ج الأول،مطبعة رينوين. ص١٣.

٥٤٩پ.ن) فارسەکان لەسەر گۆڕەپانی سیاسی ناوچەکە دەرکەوتن[٣] لەسەدەی شەشەمی پێش زایندا بەسەرکردایەتی(کۆرشی ئەخمینی ٥٦٠-٥٢٩پ.ن) وەك هێزێکی گەورە هەڵیان کوتایە سەر شاری(ئەکباتانا)* ی پایتەختی میدێکان و دەستیان بەسەرا گرت و پاش ئەوەش کەرکوکیان داگیرکرد، لە سەردەمی فارسەکاندا(داریوشی بستاسب) شورایەکی دیکەی لەدەوری شورای یەکەم بەدەوری شارەکەدا دروست کردو لەگەڵ ئەوەشدا(مذبح)ێکی ئاگریشی دروست کرد، پاشان پێنج هۆزی لە شاری(ئەستەخەر-پرسیپۆڵس)* ی

---

[٣] د.کمال مظهر احمد: کرکوك و توابعها، ص١٤.

* ئەم شارە(هەمەدانی ئێستا)یە تاڕادەیەك دەکەوێتە خۆرهەڵاتی هەرێمی چیاکان، شارێکی زۆر کۆنەو پایتەختی میدێکان بووە بەناوی(ئەکباتانا)، شارێکی گەورە بووەو قەوارەکەی نزیکەی٦کم چوارگۆشەبووە، چواردەرگای ئاسنی هەبووە، ئوستان-کورەی زۆرەو لەگەڵ سەرچاوەی ئاوی کانی کە بەهاوین و زستان ئاوی لەبەردەڕوات ئەمەش بووەتە هۆی زۆری باغ وبێستان، هەروەها کەوتووەتە سەر رێگای کۆنی کاروانەکان و رێگای حەجیش، نزیکەی(٣٥-٤٥کم)لە حلوانەوە دورەو(١٢٠کم)یش لە دەینەوەرەوە، هەمەدان شارێکی کوردنشینەو لەکاتی شاڵاوی عەرەبە موسوڵمانەکاندا ناوی هاتووە:(شوان عوسمان مستەفا: کوردستان و پرۆسیسی بەئیسلام کردنی کورد، (لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە) چاپی یەکەم، چاپو پەخشی تەما، کوردستان، سلێمانی٢٠٠٢، ل٧٠).

* پرسی پۆڵس:- شارێکی کۆنی فارسە،(داریوشی یەکەم) لەساڵانی(٥٢٠-٥١٥پ.ن)، لەدۆڵێکدا کەشاخی بەرز پارێزگاری ئەکات دروستی کرد، قەڵایەکی گەورەی تیادا دروست کراو خانوی گەورەی لە مەرمەڕ دروست

فارسییەوە هێناو تیایدا نیشتەجێی کردوون[1] سوپای مەکەدۆنیش پاش شەڕی(گاوگامیلا)** بەسەرکردایەتی(ئەسکەندەری مەکەدۆنی)* توانی سوپای

---

کراوی تیادابیناکرا، لەوانە کۆشکە شاهانە تایبەتەکەی داریوش بوو. ئەو رێگایەی بەرەو ئەو کۆشکە ئەڕۆی لەسەد پایەی مەڕمەڕ پێکهاتبوو. ئەسکەندەر لەدوای شالاوەکەی کۆشکەکەی پرسی پۆلسی سوتاند لە تۆڵەی ئەسینادا ئەمڕۆ ئەو شوێنە بە(تەختی جەمشید) ئەناسرێت، هەر لەشوێنەواری ئەویش شارێك دروست کرا بەناوی(ئەستەخر) لەسەردەمی ساسانییەکاندا، ئەکەوێتە خواروی رۆژئاوای ئێرانەوەو نزیك شاری(شیراز)ی ئەمڕۆ.(لیوس.ا.مایەر: داستانە جیهانیە هەرە گەورەکان.و بۆعەرەبی غانم دباغ، وبۆکوردی د.کاوس قەفتان، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، ٢٠٠٢، ل٢٩٧)

[1] روفائیل میناس: کەرکوك لەمێژوودا، ل ٤.

** گاوگمیلا یان(گوگمیلا) ناوی دەشتێکە دەکەوێتە نێوان ئەربیلو ئەینەواوە.(العقید محمد اسد الله صفا: الأسكندر المقدوني الكبر، طبعة الاولى، بيروت-١٩٨٥.ص٩٠)لەساڵی(٣٣١پ.ز) جەنگێك لەوسەر زەوییەی کوردستان لەنێوان سوپای فارسو مەکەدۆنی روویدا.(کەریم زەند: کوردستانی پەرت کراو.ل ٦٤)

* ئەسکەندەری گەورە: (٣٥٦-٣٢٦پ.ز) لەبیلای پایتەختی مەکەدۆنیا لەدایك بووە، لە تەمەنی دوانزە ساڵاندا قوتابی ئەرستۆی فەیلەسوف بووە. لەتەمەنی شانزە ساڵیدا کاتێك باوکی چوو بۆ داگیرکردنی بێزەنتە، کاروباری وڵاتی گرتە دەست لەتەمەنی بیست ساڵاندا باوکی کوژراو لە(٣٣٤پ.ز) لەسەرتەخت دانیشت، بەرەو ئاسیای بچوك پەڕییەوەو شارە یۆنانییەکانی لەچنگ فارسەکان رزگارکرد پاشان لەرێی سوریاو فینیقیاوە هێرشی بردە سەر میسر. پاشان ڕووی کردە فارسو سوپاکەی(داریوش)ی

داریوشی هاخامنشینی لەنزیك هەولێرەوە تێك بشكێنێتو سەركەوتن بەسەر ئێرانییەكاندا بەدەست بهێنێت[1]. دوابەدوای ئەوشالاوە، داریوشی سێیەمی دوا پادشای ئەخمینییەكان لەپاش ئەوجەنگە كوژرا.[2] پاش ئەوەی سەركردەی مەكەدۆنی رووی كردە كەركوك داگیری كردو چەند رۆژێك لەناو دانیشتوانی ئەو شارەدا مایەوە لەم بارەیەوە نووسەرێكی فارس دەڵێت:"كاتێك ئەسكەندەر سەردانی قەلای كەركوكی كرد، هەموو ئەو رێگایانەی بۆی دەچوون بە زەیتی سەرچاوەكانی شارەكە ئاگری تێ بەرداو دیمەنی بڵێسەی ئاگرەكە گەیشتبووە ئاسمان ئەسكەندەر ئەو دیمەنە زۆر سەرنجی راكێشاو سەربەخۆیی بەكەركوك بەخشی بەڵێنیشی دا لەژیاندا مابێت پارێزگاری لەسەربەخۆیی ئەوشارە بكات[3]. دوای مردنی ئەسكەندەر مەملەكەتەكەی لەنێوان هەر سێ سەركردە سوپاییەكەدا دابەش كرا،(بەتلیمۆس-Batlimos)،(سلۆكس-Sluqus)،(ئەنتیكۆنس-Antikons)، كەركوك بەركەوتی سلۆكس بوو، ئەمیش هەستاوە بەتێكدانی خانووبەرە

---

شكاندو پەلاماری بنجابی داو گرتی سەربازەكانی لێی راست بوونەوە، ناچار بەرەو نیشتمان گەرایەوەو لەرێی بابل مرد.(لویس.ا.مایەر):داستانە جیهانیە هەرە گەورەكان.ل ٢٩٦

[1] وەرگیراوە لە: موعتەسەم سالەیی: كێشەو مێژووی شاری كەركوك، گۆڤاری كەركوك، ژمارە(٢) هاوینی٢٠٠٤.ل ٩٩.

[2] العقيد محمد اسد الله صفا: الاسكندر المقدوني الكبير. ص ٦٨.

[3] روفائیل میناس: كەركوك لەمێژوودا.ل٤

کۆنەکانی و سەرلەنوێ لەسەر شێوەی نوێ ئەو سەردەمە دروستی کردوونەتەوە[٤].

سەبارەت بەسەردەمی ساسانییەکانیش مێژوونووسی ئەرمەنی(مۆڤیسیس خورینی- Moses of khurence) لەکۆتایی سەدەی پێنج و سەرەتای سەدەی شەشدا ژیاوە، پێی وایە، کە ساسانییەکان نزیکی میدیکان بوون و ناوی گەرمەکان(Garmakan) یان نا، لەوهەرێمانەی کە کەرکوك ئەکەوێتە ناوەندیانەوە[١] هەر لەوسەردەمەشدا کەرکوك بووە ناوەندێکی چالاکی فەلەکان(النساطرە)، لەهەمان کاتدا بووە بارەگایەك بۆ پیاوانی ئاینی مەسیحی(مەترانییەکان)[٢] مەسیحێکانی کەرکوك لە سەردەمی ساسانییەکاندا دەچەوسێنرانەوە. شاپوری دووەم (٣٠٩ - ٣٧٩ز) یەکێ لەتوندوتیژترین پاشاکانی ساسانی بوو کەژمارەیەکی زۆری مەسیحێکانی کەرکوکی کوشت[٣]. سەرچاوە مێژووییەکانیش جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە، شاپوری دووەم بەڕادەیەکی زۆر دیانەکان(مەسیحێکان)ی چەوساندووەتەوەو لەساڵی (٣٢٨ز) ئاگر لەشاری کەرکوك بەردەدات بەشێکی زۆری شار کاول

---

[٤] وەرگیراوە: لە عوسمان سەید قادر: کەرکوك شاری دێرینی کوردستان. گۆڤاری مرۆڤایەتی، ژمارە(٧) ئۆکتۆبەری ١٩٩٨، ل٥.

[١] وەرگیراوە لە: د.کمال مظهر احمد: کرکوك وتوابعها. ص١٤

[٢] وەرگیراوە لە: د.ج.گەرمیانی: کەرکوك شاری مێژووی سەربەرزی کوردان. ل ٢٢٠

[٣] ڕوفائیل میناس: کەرکوك لەمێژوودا.ل ٦-٧.

دەکات، خەڵکی شاریش بەتایبەتی دیانەکان لەترسانا بەرەو ژوور رادەکەن و لەشوێنێکی نزیک بەڕووباری خاسەی (ئێستا)وە نیشتەجێ دەبن، هەرکە سوپای ساسانیش شوێنەکەیانی بۆ ئاشکرا بوو هێرشی بردە سەریان و ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن[١]. بەڵام پاشتر لەسەردەمی(یەزدە گوردی دووەم ٤٣٨-٤٥٧ز) ئاینی مەسیحی لەم شارەدا تاڕادەیەك بڵاوبوونەوەی بەخۆوە بینیەوە[٢].

شالاوی عەرەبە موسڵمانەکانیش لەژێر سێبەری فەتحی ئیسلامیدا لەسەدەی حەوتەمی زاینیدا بۆسەر عێراق* ڕووداوێکی

---

[١] موعتەسەم سالەیی: کێشەو مێژووی شاری کەرکوك،ل ١٠٤.

[٢] د.ج.گەرمیانی: کەرکوك شاری مێژوو سەربەرزی کوردان،ل٢٢٠.

* کاتێك یۆنانییەکان بەسەرکردایەتی ئەسکەندەر دەستیان گرت بەسەر(عێراقی ئێستا)دا، ناوی(میسۆپۆتامیا-دۆڵی نێوان دووڕووبار) یان لێ نا،د.طة باقریش لە(مقدمة في التاريخ الحضارات القديمة)دا دەڵێت:" زاراوەی میسۆپۆتامیا زاراوەیەکی یۆنانییە، ئەو شوێنانە دەگرێتەوە دەکەونە نێوان دیجلەو فوراتەوە،(بين النهرين)یش زاراوەیەکی وەرگێڕدراوە بۆ عەرەبی لەزاراوە یۆنانییەکەوە، ئەم زاراوەیەش مێژوونوسی یۆنانی(پۆلیبیۆس) بۆیەکەم جار لەنوسینەکانیدا بەکارهێناوە بەڵام زاراوەی(عێراق) لە کۆتایی چەرخی ساسانییەکاندا دەرکەوت، کە بەهەرێمەکانی ناوەندو باشوری عێراقی ئێستا دەوترا (ابن خردزابە) یش پێی وایە، فارسەکان ئەم ناوەیان لە هەرێمەکانی باشورو ناوەڕاستی عێراق ناوە،(هرتسفێلد)ی رۆژهەڵاتناسی ئەڵمانیش دەڵێت:" زاراوەکە لە(ئیرگ-ئیرك)ی فارسییەوە هاتووە.(د.مصطفى جواد)و(احمد سوسە)و(محمود فهمی درویش)یش پێیان وایە لە(ئیراه)ی فارسییەوە هاتووە.(وەرگیراوە لە

گـەورە بـوو، کاریگەرییـەکی گـەورەی بۆسـەر پێکهاتـەی دانیشتوانەکەی هەبوو[1]. هاتنی عەرەب بۆ کوردستان لەدوای سـاڵی(١٦ك-٥٩٦ز)وە بـوو[2]، سـەبارەت بەناوچـەی کـەرکوك‌و دیالـەش عـەرەب بۆجـاری یەکـەم لـەدوای فتوحـاتی ئیـسلامی گەیـشتووەتە ئـەم ناوچـەیەو لەسـاڵی(٢٢ك-٦٠٢ز) گەیـشتنە ناوچەی شارەزوور. لەوکاتـەدا کەرکوك‌و ناوچەکانی دەوروبەری بەشێك بوو لەشارەزوور پێش هاتنی ئیسلامیش، عەرەب کەمو زۆر لەسنوری ناوچەکانی کەرکوك‌و دیالە نەبووە.[3] بەم شێوەیە ناوچـەکە پـاش هـاتنی ئـاینی ئیـسلام بـووە بەشـێك لـەجیهانی ئیسلامی‌و هەر لەسـەردەمی خەلافـەتی راشـیدین‌و دواتریـشەوە، وەکـو سـەرجەم ناوچـە ئیـسلامییەکانی دیکـە حـوکم دەکـرا، نەبوونی شاری گەورەو پانتایی ئاوەدانی فراوان، کەمی رووداوی سیاسی دیار، لەوێ‌و دوورە پەرێزی زۆربەی مێژوونوسانی ئەو سەردەمە لەیاداشت کردنی ئەوزانیاری‌و رووداوانەی بەپێوەری ئەوکات بایەخدار نەبوون. هـەموو ئـەم بەڵێنانـەو بەشێوەیەکی

---

عبدالرقیب یوسف: حدود کردستان جنوبیة تاریخیاً او جغرافیاً، طبعة الأولی، سلیمانیة٢٠٠٥..ص(١١-١٢).

[1] د.خـەلیل ئیـسماعیل: رەهەنـدی نەتـەوەیی ئیـشتەجێ بـوونی عـەرەب لەپارێزگای کەرکوك، گۆڤاری سەنتەری برایەتی. ژمارە(٢٠) ساڵی٢٠٠١.ل ٢٠٥.

[2] وەرگیراوە: لە جەلال جەوهەر: پاکتاوی نەژادی لەکوردستان، گۆڤاری کەرکوك. ژمارە١١ی ساڵی پێنجەم، زستانی ٢٠٠٢، ل٨٧ .

[3] جەلال جەوهەر: پاکتاوی نەژادی لە کوردستان.ل١٠.

گشتی لەسەردەمی خەلافەتی ئیسلامیدا، لەپشت نەبوونی هەواڵی مێژوویی و زانیاری تایبەت بەناوچەی کەرکوکن،دواتر کەوتووەتە ژێر دەستی مەغۆلەکان و لەوکاتەشەوە بۆماوەی نزیکەی دوو سەدە، ناوچەکە نوقمی هەراوپشێوی هێزە داگیرکەرو پەلاماردەرەکانی ناوچەکە بووە.[1] لەماوەی شاڵاوو پەلاماری مەغۆلەکاندا گەلی کورد لەبارودۆخێکی زۆر خراپدا دەژیا، لەگەڵ لەدەست دان و تێکچوونی ماڵ بەهۆی هێرشی مەغۆلەکانەوە، ئەو کوردانەشی لەشاڵاوی مەغۆلەکان مابوونەوە هەڵهاتبوون بۆ ناوچە شاخاوییەکانی کوردستان، ژیانی کوردەواریش بەشێوەیەکی گشتی لەسەدەکانی(١٣-١٤-١٥ ز )دا زۆر زەحمەت وگران بوو، کوردستان لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر دەکەوتە بەر پەلاماری داگیرکەرە جیاوازەکانەوە.[2]

لەسەرەتای سەدەی شانزەیەم، لەکاتی دەرکەوتنی هەردوو دەوڵەتی سەفەوی لەرۆژهەڵاتی کوردستان و دەوڵەتی عوسمانی لەرۆژئاوای کوردستان بەڕووخسارە جوگرافییە مرۆییەکەی، لەباکورەوە لەشاخەکانی ئارارات و رووباری ئاراسەوە، تاوەکو پارچەکانی نزیک بەغدا لەباشور، بووە گۆڕەپانێکی ململانێ لەنێو ئەو دوو دەسەڵاتە شەڕانگێزەدا[3]. بەڵام دەرکەوتنی

---

[1] وەرگیراوە لە قادر محمد: ناوچەی کەرکوك لەسەردەمی عەباسییەکاندا، گۆڤاری سەنتەری برایەتی ژمارە(٢٠)سالی ٢٠٠١.ل ل ١٠٤-١٠٨.

(2) Fuad Taher Sadiq :Abrief History Of Kurdistan ,Kurdistan-2000.p34.

[3] جەلال جەوهەر: پاکتاوکردنی نەژادی لەکوردستان.ل١١.

عوسمانییەکان لەم ناوچەیەو عێراق بەگشتی بەشێوەیەکی کرداری لەسەردەمی سوڵتان سلێمان قانونیدا بوو، کاتێك لەگەڵ سوپاکەیدا لەساڵی (١٥٣٤ز)چووە نێو بەغداوە لەرێگای تەبرێزو(سلێمانی ئێستا)وە[1] پاشان ئیدارەی عوسمانی بۆ پتەوکردنی دەسەڵاتی خۆی هەندێك لەوبنەماڵە تورکانەی** جێی متمانەی ئالی عوسمان بوون، پاش سەندنەوەی عێراق لەسەفەوییەکان، لەکەرکوك نیشتەجێ کران و ئیدارەی عوسمانیش پۆستی(موتەسەلمیت) واتە پۆستی ئیداری بەسەرۆکەکانی ئەو بنەماڵە بەرەچەڵەك تورکانە سپارد وێڕای

---

[1] د.كمال مظهر احمد: كركوك وتوابعها، ص ٣٢.

* مێژووی پەیوەندی نێوان کوردو تورك دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پێش دەرکەوتنی دەوڵەتی عوسمانی، بەڵام پەیدا بوونی دەوڵەتی عوسمانی وێستگەیەکی گرنگی پەیوەندی نێوان کوردو تورك پێك دەهێنێت (فەرید ئەسەسەرد: نوسینێك دەربارەی گۆڤارەکە، گۆڤاری دۆسیەی تورکیا، ژمارە(١)ی مایسی ٢٠٠٥،ل٣).

** وشەی(تورك) ناسەرەتای سەدەی نۆزدەیەم تەنیا بەجوتیارەکانی ئاسیای بچوك وتراوە. کاربەدەستانیش بەخۆیان دەگوت عوسمانی، ئەم نازناوەشیان لەباپیرە گەورەیانەوە وەرگرتبوو.(د.عبدالله غفور: جوگرافیای کوردستان، چ چوارەم،چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر-٢٠٠٥، ل ١٨٧).

* - پاش لابردنی دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی و دامەزراندنی کۆماری تورکیا بەشێوەیەکی رەسمی وشەی تورك و تورکیا بەکار هاتووە.(د.جەلیلی جەلیل: کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، و.لەرووسییەوە د.کاوس قەفتان، بەغدا- ١٩٨٧، ل ٣٠٢).

بەخشینی نازناوی بالا، ئەو بنەمالانەش لەلایەن خۆیانەوە پشتگیری بەردەوامی حوکمی عوسمانی و کلتورەکەیان دەکرد.[*]

لەسالی( ١٦٣٨ن)دا سولتان مورادی چوارەم، بەتەواوەتی دەستی بەسەر عێراقدا گرت و دابەشی کرد بۆ سێ ویلایەت[**] : موسل، بەغدا، شارەزوور لەکەرکوك، پاش ماوەیەك دەستی بەسەر بەسرەشدا گرت و کوردی بەبەشێك لەئیمپراتۆرییەتی عوسمانی.[1] بەلام سالێك پاش ئەوەو لەسالی (١٦٣٩ن)دا، سلێمان پاشای بابان شاری کەرکوکی لەدەسەلاتی عوسمانێکان سەندەوە، کە لەبەغداوە حوکمیان دەکرد موتەسەریفەکەیان بە ناوی(دلاوەر) کوشتووەو ئەم شارەیان هێناوەتە ژێر دەسەلاتی میرنشینێکی کوردی بەهاوکاری و پالپشتی خەلکی شاری کەرکوك، لەکاتێکدا دەسەلاتی عوسمانییان پێ قەبول نەبووە.[2] لەماوەی دەسەلاتداری عوسمانیەکان لەم ناوچەیەدا، توشی هێرشی چەکداری زۆربووە لەلایەن فارسەکانەوە، هێرشی هەرە

---

[*] د.نوری تالەبانی: سیاسەتی گۆرینی واقعی نەتەوەیی کەرکوك لەکۆنەوە تا ئەمرۆ، گۆڤاری کەرکوك ،ژمارە (١) ی سالی سێییەم، لا ٤٤

[**] زاراوەی(وویلایەت-Vilayat ) زاراوەیەکی عەرەبییەو دراشێوە بوو لەشێوەکانی نیالەت.(ستیڤنس.هـ.لونگریك: اربعة القرون من التاريخ العراق الحديث، ت.جعفر خياط، طبعة الاولى، بغداد- ١٩٤١، ص٣٧.)

[1] د.فاضل حسين: مشكله الموصل، بغداد-١٩٧٧،ص١٠٥.

[2] وەرگیراوە: لە عوسمان کانی پانکەیی: کەرکوك شاری مێژووینەی کوردنشین، گۆڤاری بانە رۆژ(گۆڤارێکی روناکبیری گشتی یە، کۆمەلەی روناکبیری کەرکوك دەری دەکات) ژمارە(٢٢)نەیلولی٢٠٠٥، ل٨.

گەورەو بەهێزی فارسەکانیش ئەو هێرشە بوو بەسەرکردایەتی (نادرشا)، بۆ سەر ئەم شارە لەساڵی( ١٧٤٢ی.ز) ئەنجامیاندا سوپای فارس لەئەسفەهانەوە بەرەو کوردستان هاتو ژمارەیان نزیکەی ١٠٠هەزار جەنگاوەربەبوو لەنزیك دوزخورماتوو نادرشا وەستاو بەشێك لە سوپاکەی بۆ دەست بەسەراگرتنی شاری کەرکوك نارد، بەڵام ئەوهێزانە لەلایەن کوردەکانەوە توشی بەرهەڵستییەکی گەورە بوون، بەم جۆرە لەسەرەتاوە هێزەکانی قاجاری نەیانتوانی شارەکە بگرن، بۆیە زیاتر توانیان چوار دەوری قەڵاکە بگرن و هەندێك بەشی شورەی قەڵاکە بەمەنجەنیق و تۆپ بڕوخێنن ئەوەش وایکرد خەڵکەکەی لەوەزیاتر نەتوانن بەرهەڵستی بکەن و بەناچاری خۆیان بەدەستەوە داو بەشێکی زۆری شارەکەش وێران بوو، ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی شار کوژرا دوای سەرکەوتنی ئەم شاڵاوەیان، فارسەکان رووباری خاسەیان بڕیوەو چواردەوری گوندی قۆرییەیان گرتووە، کە کەوتووەتە بەشی خۆرئاوای قەڵاکەوە، دانیشتوانی گوندەکەش بەناچاری خۆیان بەدەستەوە داوە.[1] بەم شێوەیە لەماوەی ساڵانی ململانێی نێوان دەسەڵاتدارانی شیعەی ئێرانی و ئیمپراتۆری سونی عوسمانیدا، کوردستان بەگشتی ببووە شەرگەیەکی

---

[1] وەرگیراوە لە کەمال مەعروف: قەلای کەرکوك لەڕوانگەی شوێنەوارو مێژوودا، گۆڤاری بانەڕۆژ، ژمارە(٤)ی ئازاری-٢٠٠٤، ل٤٩.

بەردەوامی نێوانیان و شاری کەرکوکیش بەشێک بووە لەو ململانێیە[٢].

[٢] د. نوری تاڵەبانی: سیاسەتی بەعەرەبکردنی کەرکوک، و.مەریوان حسین چیمەنی. سلێمانی-٢٠٠٣.ل١١.

# باسی یەکەم

## چەمکوزاراوەو ڕەچەڵەکی ناوی کەرکوک

سەبارەت بەناوی کەرکوک، هەر لەدێرزەمانەوە بەچەندین شێوە هاتووە، بەهۆی مێژووی درێژی بونیادنانی ئەم شارە و تێپەڕبوونی چەندین قۆناغی دەسەڵاتدارێتی ناوخۆو دەرەکی بەسەر ئەم شارەدا، جیاوازی زمانو شێوە زارەکانی ئەو دەسەڵاتە نێوخۆییو دەرەکیانە، وای کردووە ئەم شارە هەر لەکۆنەوە چەندین ناوی بەسەردا ببڕێت، لێرەدا هەوڵ دەدەین ئاماژە بە هێندێك لەوناوانە لەقۆناغە جیاوازەکاندا بکەین.

بەپێی بەڵگە مێژووییەکان ئەوە سەلمێنراوە، کە(ئارابخا) کۆنترین ناوی کەرکوکە هەروەك لەنوسراوێکی مێخیدا لەبەشی خوارەوەی قەڵای کەرکوك، لەپارچەی(٥)ەمدا دۆزراوەتەوە،

مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەی دووەمی پێش زاین.[1] سەبارەت بەزمانی قسەکردن و گفتوگۆیش لای ئەوان لەوقۆناغە مێژووییەدا، ئەوەیە کە زمانی سەربەخۆی خۆیان(زمانی گوتی)، زمانی دانیشتوانی کوردستانی کۆن بووە، زمانێك بووە سەرجەم بنەما زمانەوانییەکانی لەخۆگرتووەو لەزمانەکانی ئاشوری و سۆمەری و ئەکەدی و بابلی جیاوازبووە.[2] سۆمەری و ئەکەدییەکانیش دانیان بەوەدا ناوە کە شانشینێك بەناوی(شانشینی گوتی) هەبووەو پایتەختەکەشی(ئارابخا) بووە.[3]

(د.جمال رەشید)یش پێی وایە: ئارابخا شاری کەرکوکی ئێستا بووەو ماوەیەك هۆزی(گورمو)ی ئارامی تێدا نیشتەجێ بوون.[4] (عبدالرزاق الحسنی) پێی وایە: ناوی کەرکوك بۆ دوو نوسراوی کلدانی کۆن دەگەڕێتەوە.[5]بابلییەکان بەم شارەیان

---

[1] عبدالرقیب یوسف: العالم الاثریه والتراثیه في مدینة کرکوك، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە(۱) سالی سێیەم. هاوینی ۲۰۰۰، ل۱۰۵).

[2] کەیوان ئازاد ئەنوەر: کەرکوك لەمێژووی کۆندا: گۆڤاری کەرکوك، ژمارە(۲-۳) پایزی ۱۹۹۹،ل۷٤.

[3] د.شاکر خەسباك: کوردو مەسەلەی کورد، و.لەعەرەبییەوە: نەجمەدین شاکەل، چاپی دووەم.دەزگای چاپی بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر-۲۰۰۵. ل۱۷.

[4] دارسات کردیه في بلاد سوبارتو، بغداد-۱۹۸٤، ص ۳۰-۳۱

[5] عراق قدیماً وحدیثا، ص ۲۱۷.

وتووه(ئامانجه Amanya).[١] لای سۆمەرییەکانیش بە(کنهار) ناسراوه.[٢] لەچەرخی حورێکانیش ناوی(ئارابخا) بووەو دوای هاتنی سامیەکان بووه بە(کارمای)و دواتریش بە(کارکا).[٣]

مامۆستا (تۆفیق وەهبی) پێی وایە: ناوی کەرکوك پێکهاتووه لە(کر)ی ئاشوری‌و پاشان(هك)ی پێوەلکاوە، بۆئەوەی بەسوك‌و ئاسانی بووترێت[٤]و ڕایەکی دیکە پێی وایە(کارکۆك)، واتە ئیشی زۆر باش‌وچاك کە لەمێژەوه ئەم شارە دانیشتوانەکەی بەئیشی چاك‌و پوخت لەهەموو بوارەکاندا خەریك بوون‌و لەزووربەی شوێنەکانەوە ڕوویان تێ کردووه[٥].

ڕۆژهەڵاتناسی ئینگلیزیش(کۆلیسترنج)، پێی وایە." ئەم تەپۆلکە شوێنەوارییەی قەڵای کەرکوکی لەسەر بونیاد نراوە، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی هەزارەی دووەمی پێش زاینی‌و ناسراوه بە ئارابخا."[٦] وڵاتی میسۆپۆتامیا لەساڵی(

---

[١] عوسمان سەید قادر: کەرکوك شاری دێرینی کوردەواری، ل٥١-٥٢.

[٢] مجموعة من الأكادميين العراقين: كركوك مدينة القوميات المتآخيه(وقائع الندوة العلمية التى عقدها مركزكربلاء للبحوث والدراسات في لندن ٢٢/٢١تموز ٢٠٠٢م)، طبعة الأولى،٢٠٠٠، ص ٧٤

[٣] د.ڕەشاد میران: ڕەوشی ئایینی‌و نەتەوەیی لەکوردستان،چاپی دووەم، ٢٠٠٠، ل٢

[٤] وەرگیراوە: لەموعتەسەم ساڵەیی: کێشەو مێژووی شاری کەرکوك، ل٩٨.

[٥] د.جمال رشيد احمد: كركوك في عصور القديمه، ص ٨٣.

[٦] بلدان الخلافه الشرقيه، ت. بشير فرنسيس، طبعة الأولى، بغداد-١٩٤٥، ص ١٢

٣٣٣پ.ز) کەوتە بەر شالاوی ئەسکەندەری مەکەدۆنی کوڕی فلیپ[١] گڕی ئاگرە ئەزەلییەکەی ئەوشارە سەرنجی مەکەدۆنیکانی راکێشابوو، مێژوونوس(پلوتارخ) ناوی ئەم شارە بە(کورکورا) دەبات، بێگومان ناوچەی بابەگوڕگوڕی ئێستایە، ئەوسا بەتەنیشت شاری ئارابخای سەر بەمیدییەکان بووە،( جمال رەشید)یش وای بۆدەچێت: ناوی کەرکوک پەیوەندی بەو ناوە هلینییەوە هەبێت کە پاشگری(AK)ی سوباری خراواتە سەر، بووە بە(کورکوراك-Korkourk). لەسەردەمی سلۆقییەکانیشدا پێی وتراوە(کەرخ-سلۆق) بەمانای شاری سلۆقییەکان دێت.[٢]هێندێکی دیکە دەڵێن ناوی(کەرخاوسلۆخ)،بە مانای شاری شورەدار دێت، ئەم بۆچوونەش هێندێك راستی تێدا بەدی دەکرێت، وەك ئەوەی دەوروبەری قەلاکە لە هەرچوار لاوە بەدیوارێکی بەرزو بڵند دەورە دراوەو بازگەیەك خانووبەرەی لەسەر دروست کراوە.[٣] (عبدالرزاق الحسنی)یش دەڵێت:"بەتلیمۆس بەدووکافی فارسی(کورکورا) ناوی کەرکوکی بردووە."[٤] *

---

[١] لیلی نامق جاف: کرکوك لمحیات تاریخیە، منشورات خبات، اربیل-١٩٩٢، ص٢٨.

[٢] وەرگیراوە لە:موعتەسەم سالەیی: کێشەو مێژووی شاری کەرکوك، ل ٩٨-٩٩.

[٣] عوسمان سەیدقادر: کەرکوك شاری دێرینی کوردەواری، ل٥.

[٤] العراق قدیما و حدیثا ، ص٢١٨.

(د.طه باقرو فوئاد سفر) یش پێیان وایە: پێدەچێت ناوی کەرکوك لەزاراوەی(کرکر)ەوە هاتبێت. وەکو ناو بۆ ناوەندێکی ئاگرینی دەرەوەی کەرکوك.[1] لەسەردەمی ساسانییەکانیشدا کەرکوك بەناوی(گەمرەکان) ناوبراوە[2] لەسەدەو سەردەمەکانی دەسەلاتداریی خەلافەتی ئیسلامیدا، واژەی(باجرمێ-باگرمێ) بەکارهاتووە بۆ ناوچەی کەرکوك، ئەم واژەیەش لە(پێش گەرما)ی ئارامییەوە وەرگیراوە بەتایبەتی برگەی یەکەمی ناوەکە(پێش)کە بەواتای مەلبەند دێت، برگەی دووەمی ناوەکە(گەرمای) لەووشەی گەرمیانی کوردییەوە وەرگیراوە.[3]

بەگوتەی نوسەری(خرۆنیکا) کە چەندین سەرچاوە لەوانە بەئێمە نەگەیشتوون و بەکاریهێناون. ناوچەی(گارمای) کە(کارکادی)و(بیت سلوخ) یەکێك لەشارە هەرەگەورەکانی بوون. لەکاتی پێش هاتنی ئێرانییەکان جاریێ مەملەکەتی گارمای بووە، رووبەرێکی فراوانی میسۆپۆتامیای سەروی گرتووەتەوە. سنورەکانی لەسەروی رۆژئاواوە لەزێی گەورەوە، تا

---

* ئاساییە کەرکوك لەیەك کاتدا لەناوێك زیاتری هەبووبێت، هەر وەك ئێستاش لەجیهاندا شار هەیە لەناوێك زیاتری هەیە، یان چەند شارێك هەن یەك ناویان هەیە.

[1] وەرگیراوە لە: لیلی نامق جاف: كركوك لمحيات تاريخية. ص ٢٩.

[2] وەرگیراوە لە:د.ج. گەرمیانی: کەرکوك شاری مێژوو سەربەرزی کوردان، ل٢٢٠

[3] دیداری گۆڤاری کەرکوك لەگەڵ شوێنەوارناس(پاکیزە کەمال) ژمارە(٢-٣) پایز و زستانی ١٩٩٩-٢٠٠٠. ل٨٧.

دیجلە(دێكلات) دەڕوا، لەوێشەوە تازێی دیالە(ئەتراك و تۆرماراشیان پێ گوتووە)، دەبوو لە سنوری خواروی، ڕۆژهەڵاتی(بیت گارمای) تا زەوییەكانی(لاداب وچیای شێروان) درێژ دەبووەوەو گارمای لەهەمەدان جیا دەكردەوەو تازێی بچوك دەچوو دەبووە سنوری باكوری ناوچەكە، كەواتە مەملەكەتی گارمای هەمان ڕووبەری ئارابخای خوری دەگرێتەوە.[1]

مێژوونووسی ڕۆمانیش(ئەمیانۆس) بەناوی(كارك) ناوی كەركوكی بردووەو هەروەها(كارشا) كەلە(كەرخا)وە هاتووە باسی لێوە كردووە.[2]

(د.مصطفى جواد)یش دەڵێت: كەركوك لەڕووكاردا لەناوی (كەرخینی) یەوە هاتووە، ئینجا بۆ(كركی)، پاشان لەڕێی زمانی فارسییەوە بووە بە(كریك)، پاش ئەوەش گۆڕاوە بۆ(كەركوك)، بۆیەكەم جاریش لەسەردەمی تەیموری لەنگدا، شێوە زاراوەی(كەركوك)، لەلایەن(شەرەفەدین عەلی یەزیدی)یەوە لەمیانەی لێكۆڵینەوەیەكدا، لەسەر ڕووداوەكان لەساڵی(٨٠٦ك/١٤٠٣ز) بەكاریهێناوە[3]. لەپەرتوكێكدا بەناوی(تاریخ تیمور یان زەفەر نامە)، تیایدا هاتووە: "تەیمور عێراقی داگیر كرد، لە ڕێگای داقوق و(كەركوك)و ئاڵتون

---

[1] ت.ل. ڤیلچیڤسكی: ئەژادی كورد، وەرگێڕانی بۆ كوردی، د.رەشاد میران، چاپی دووەم، هەولێر-٢٠٠٠، ل ل١٧٤-١٧٥.

[2] وەرگیراوە لە :فاتیح عبدالله: پارێزگای كەركوك، ل١٧.

[3] وەرگیراوە لە: مجموعة من الأكادمين العراقين: كركوك مدينة القوميات المتاخيه ص٧٣-٧٤

کۆپرییـــەوە بـــەرەو دیاربـــەکر بەرێکـــەوت، لـــە( ٢٠ی کـــانونی یەکەمی١٤٠٣ی.ز) دا بەجێی هێشت، ئەوەش یەکەم ئاماژەیە کە بەراشکاوی و کە راستەخۆ بۆناوی شاری کەرکوك دەکرێ.[١]

لەئەنجامـدا دەتـوانین بڵـێین کـەناوی کـەرکوك، داتاشـراوی چەندین زاراوەو ناوی تری پێشوی خۆیـەتی، لەمیانـەی سـەرجەم زمـان و شـێوەزارەکانی دەسـەڵاتدارە نێوخـۆیی و دەرەکییـەکان لەقۆناغە جیاوازەکاندا هاتووەتەکایەوە.

---

[١] وەرگیراوە لە:د.ج.گەرمیانی: کەرکوك شاری مێژوو سەربەرزی کوردان. ل٢٢٠.

# باسی دووەم

## کەرکوک لەئینسکلۆپیدیای بیانی و ئیسلامیدا

(Encyclopucdia – الموسوعة–دائرة العارف):– بریتییە لە شێوە بانکێکی زانیاری، بوارو پسپۆری جیاجیا لە خۆ دەگرێت، بەڕێوەبردنیشی خەڵکانێکی ئەکادیمی و پسپۆر لەئەستۆی دەگرن، هەر زانیارییەک لەئینسکلۆپیدیادا دیاری بکرێت راستییەکی زانستی و بابەتی دەبێت، بەشێوەیەک گشت لایەک کۆکن لەسەری و سەرچاوەیەکی گرنگە، بۆهەموو لێکۆڵەرو پسپۆرەکان لەجیهاندا.[1]

لێرەدا هەوڵدەدەین، ئاماژە بەکوردستانییەتی کەرکوک بکەین لەئینسکلۆپیدیای بیانی و ئیسلامیدا، لەپاڵ ئەوەشدا

---

[1] وەرگیراوە لە: ئەحمەد عەزیز: کوردستانییەتی کەرکوک لەئینسایکلۆپیدیای وڵاتانی ئەورووپا وئەمریکادا. گۆڤاری کەرکوک، ژمارە(١٦)، بەهاری ٢٠٠٣، ل٥٥.

راوبۆچوونی ژمارەیەک لەبیانی و نوسەرە عەرەبەکان و سەرچاوە عەرەبییەکان لەوبارەیەوە دەخەینە ڕوو.

ئینسایکلۆپیدیای بەریتانی ئاماژە بۆئەوە دەکات: "کەرکوک شارێکە دەکەوێتە باکوری عێراق،(١٤٥میل-٢٢٣کم) لەباکوری بەغدا، پایتەختی نیشتمانییەو، بەهۆی ڕێگای زەمینی و هێڵی شەمەندەفەرەوە بەبەغداوە دەبەسترێتەوە، دەکەوێتە نزیک زنجیرە چیای زاگرۆس لەهەرێمی کوردستانی عێراق"[1]. ئینسکلۆپیدیای دانیمارکی لەنوێترین چاپیدا بەم شێوەیە کەرکوک دەناسێنێ: " کەرکوک شاری کێڵگەی نوتە، دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەلاتی عێراقەوە، بەشێکە لەکوردستان و(٢٥٠کم) لەبەغداوە دوورە، هەندێ لەمەزەندەکانی کێڵگەکانی نەوت لە کەرکوک وای دەردەخەن، کە نزیکە(٧,٥٪)کۆی یەدەگی نەوتی جیهانی تێدایە." لە ئینسایکلۆپیدیای دەزگای(MICOSFT)ی ئەمریکیدا هاتووە: "کەرکوک شارێکە دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەلاتی عێراقەوە، سەنتەری هەرێمی کەرکوک دەوڵەمەندترین کێڵگەکانی نەوتی عێراقی تێدایە. هێڵی سەرەکی نەوتی عێراق لە کەرکوکەوە بەرەو کەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاست دەچێت، سەنتەرێکی گرنگی بازرگانی ناوچەکەیەو بەروبوومی کشتوکاڵی دانەوێڵەو میوەو ئاژەڵی لێیە، لە شاری کەرکوکدا

[1] William Benton & Helen H.B.Benton, Encylopadia Britannica, 15 EDITION, Prined in - U.S.A- 1974, P 834.

پاشماوەی شارستانییەتی کۆن دۆزراوەتەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ (٣٠٠٠)ساڵ پێش زاین."[١]

ئینسایکلۆپیدیای ئەڵمانی لەدوا پێناسەی شاری کەرکوک دا دەنوسێت:" کەرکوک بەپێی مێژوو دەگەڕێتەوە بۆ سەر کوردستان، کوردستان وعێراق لەساڵی (١٦٣٨ز )دا کەوتە ژێر رکێفی دەسەڵاتی عوسمانییەکان و لەکاتی جەنگی یەکەمی جیهانیشدا، کەوتە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیا...هتد."[٢].

ئینسکلۆپیدیای ئیسلامی، دەربارەی ناوچەی کەرکوک نوسیویێتی: "دەسەڵاتی راستەقینەی ئەم ناوچەیە، لەسەرۆکە کوردە خۆجێیەکانی ناوچەی ئەردەڵان بوون، دەوڵەتی عوسمانیش دواتر توانی بەپشت بەستن بەچالاکی پاشاکانی شارەزوور، دەسەڵاتی خۆی بەسەر ئەم شارەدا بسەپێنێ."[٣]

شەمسەدین سامی، زاناو گەڕیدەی ناوداری تورك لەتۆمارەکەیدا ئاماژە بەشاری کەرکوک دەکات و دەڵێت:"کەرکوک یەکێکە لەشارەکانی کوردستانی سەربە ویلایەتی موسڵ و سێ

---

[١] وەرگیراوە لە احمد عزیز: کوردستانییەتی کەرکوک لەئینسایکلۆپیدیای ئەوروپایی و عەرەبی و ئەمریکیدا، و.لەعەرەبیەوە: مەجید ساڵح، گۆڤاری بانەرۆژ، ژمارە(١٢) تشرینی دووەمی ٢٠٠٤، ل ل(٣-٤).

[٢] احمد عزیز: کەرکوک لەئینسایکلۆپیدیای....هتد گۆڤاری کەرکوک ژمارە١٦ی بەهاری ٢٠٠٣، ل٥٦-٥٧.

[٣] وەرگیراوە لە پ.د.ئازاد نەقشبەندی: کاریگەری نەوتی کەرکوک لەسەر راگوێزانی کورد لەکەرکوک و بەعەرەب کردنی، گۆڤاری سەنتەری برایەتی ژمارە ٢٠ی هاوینی ٢٠٠١، ل٢٢.

چــــارەکی دانیــــشتوانەکەی کــــوردنو ئــــەوانی دیکــــەش تورکوعەرەبوجولەکەو کلدانین."[1]

لەئینـسکلۆپیدیای جیهـانی عەرەبیـدا کـە لـە شانـشینی سعودیە دەرئەچێت، لەلایەن دەزگای بڵاوکردنـەوەو دابەشکردنی ئــەو وولاتــەوە، ســەبارەت بەکــەرکوك نوســراوە:" کــەرکوك بەپایتــەختی کوردەکــان، لــەباکوری عێــراق دادەنرێــت، لەلاپــەڕە(٤٤٩)دا کــەرکوك بەیــەکێك لەشــارە ســەرەکییەکانی کوردستانی عێراق دادەنێت."[2]

بۆ جەخت کردنەوە لەسەر باسەکەمان، لێرەدا هـەوڵ دەدەیـن ڕاو بۆچوونی گـەلێك لـەبیانیو عـەرەبو تورکـەکان بخەینـە ڕوو (ژان ئۆنـارە) نوســەری فەرەنــسایی لەســاڵی(١٧٧٤ن)دا بــە کوردســتاندا تێپــەڕیوەو لـەبارەی کەرکوکـەوە دەڵێـت:"کـەرکوك پایتەختی ویلایەتی شارەزوورەو بەشێکە لەکوردستان."[3]

(د.ڕۆهــەر) زانــاو نوســەری ئــەڵمانی، لــەکۆتایی ســەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستدا سەردانی کوردستانی کردووە، پاشــان کتێبێکــی دانــاوە بــەناوی(ڕێگــای بەغـدا) لەوکتێبــەدا دەربــارەی پــەترۆڵی کوردســتان نوســیوێتی:"خــۆم ســەردانی سەرچـاوە پەترۆڵییـەکانی کـەرکوکم کـرد، هـەروەها ســەردانی

---

[1] قاموس ئیعلام، ١٣١٥ك-١٨٩٨ز، ئەستەمبوڵ، ل ٣٨٤٨.

[2] وەرگــیراوە لــە، احمــد عزیــز: کــەرکوك لەئینــسکلۆپیدیای.... گۆڤــاری بانەڕۆژ، ژمارە(١٢) تشرینی دووەمی٢٠٠٤ ل٤.

[3] وەرگیراوە لـە: پشکۆ حەمـە تـاهیر ئاغجەلـەری: ڕاپـەڕینی کـەرکوك ساڵی ١٩٩١، چاپی یەکەم، سلێمانی-٢٠٠٤، ل٣٤.

سەرچاوەکانی تریشم کرد لەدەوروبەری بابەگوڕگوڕ......ڕۆژهەر لەم نوسینەیدا ئاماژە بەوە دەکات، ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە مافی بەدەستهێنانی ئەو پەترۆلەیە لە(کوردستاندا)."[1]

(عبدالرزاق الحسنی)یش لەبارەی کەرکوك و دانیشتوانەکەیەوە دەڵێت:"دانیشتوانی کەرکوك دابەش دەبێت بۆسێ ڕەگەز. کورد، عەرەب، تورکمان، بەلام زۆرینەی دانیشتوانەکەی کوردن، چونکە زۆرینەی هۆزەکانی لیواکە کوردن."[2]

(د.شاکر خەسباك)یش دەڵێت:" کوردستانی عێراق بریتییە لە چوار پارێزگا(لیوا)، پارێزگاکانی موسڵ، هەولێر، سلێمانی، کەرکوك، هەروەها بەنێو پارێزگای دیالەشدا درێژەی هەیەو ناوچەکانی خانەقین و مەندەلی دەگرێتەوەو ئەو پارێزگایانەش بەشی باکوری رۆژهەلات پێکدەهێنن."[3]

(علی جواد) لە کتێبی(ممالك عثمانننك تاریخ وجغرافیا لغاتي)، دەڵێت:"کەرکوك مەڵبەندی قەزای سەنجەقی*

---

[1] کامەران احمد: کوردستان لەنێوان ململانێی نێودەوڵەتی و ناوچەیدا،(١٨٩٠-١٩٣٢)، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٠،ل٦٦.

[2] العراق قدیماً وحدیثاً، ص ٢٢٠.

[3] د. شاکر خەسباك: کوردو مەسەلەی کورد، ل٤٥.

* سەنجەق: زاراوەیەکی تورکییەو بەواتای(علم)دێت، شوێنێك دەگرێتەوە بەگی سەنجەق دەبیات بەڕێوە. پاشتر بەواتای یەکەیەکی ئیداری دەهات، سەر بەئەیالەت کە موتەسەڕیفێك حوکمی دەکرد.(لون گریك: اربعة القرون،-ص ٣٦٩). بەلام لە(دائرة المعارف الاسلامی)دا دەڵێت:"زاراوەیەکی

شـارەزوورە، لـە(٥) ناحیـەو(٣١٠)گونـد پێکهـاتووە، دووچـیای گرنگی هەیە، یەکێکیان چیای حەمرینو ئەویتریان(قەرەچوغ)ە، لـەناو قـەزادا، ژمارەیـەکی زۆر بـیری نـەوت هەیـەو خەڵکەکـەی لەجیاتی مۆموگاز بەکاری دەهێنن، دوور لەقەزاکە شوێنێك هەیە بـەناوی بابـەگوڕگوڕ، نـەوتی تیادایـەو ئاگرەکەشـی لـەدوورەوە دیارە."[1]

لـــەدوا چاوپیاخـــشاندنمان بەئینـــسکلۆپیدیای بیـــانیو ئیسلامیو ئاماژەکردن بەڕاو بۆچوونەکانی ژمارەیەك لە لەبیانیو عەرەبو تورکەکان، لـەبارەی کەرکوکـەوە، دەتـوانین ئـەو راسـتییە هـــەڵهێنجین، کـــەرکوك هەرلەمێـــژەوە شـــارێکی کوردســـتانییەو ســـەرجەم ئینـــسکلۆپیدیاکانیش کـــەرکوکیان بەشـــارێکی گرنگـــی کوردستان ناوبردووە.

---

تورکییەو بەواتای( الرایة، العلم، اللواء) دێت لەیەکەیـەکی ئیداریدا، چاوگی سـەرەکی زاراوەکەشـی لەلایـەن سـەلجوقییەکانەوە بـەکارهێنراوە." (احمـد الـشناوی، دائـرة معـارف الأسـلامی، المجلـد ثـانی العـشر، ص٢٤٩-٢٥٢.) (لیوا)یش زاراوەیەکی عەرەبیە، یەکەیـەکی ئیداری دەگرێتـەوە(متـصرف)ێك حوکمی دەکات، هەروەها یەکەیە لەیەکـەکانی سوپا دەگرێتـەوە.(لونگریـك: اربعة القرون، ص٣٧٠).

[1] وەرگـیراوە لـە: کوردسـتان لەچاپکراوەکانی عوسمانیـدا: فەیسـەڵ دەبـاغ لەتورکی عوسمانییەوە کردویەتی بەکوردی، چاپی یەکـەم، هـەولێر-٢٠٠٤، ل١٣.

# باسی سێیەم

## سنوری جوگرافی (کەرکوک-کوردستان)

**یەکەم/سنوری جوگرافی کەرکوک:**

ئەگەر سەیرێکی سنوری جوگرافی کەرکوک بکەین، دەبینین هەر لەکۆنەوە چەندین گۆڕانکاری بەسەر ئەو سنورەدا هاتووە. بێگومان ئەمەش زیاتر بۆ ئەو ململانێ نێوخۆیی و ناوچەییانە دەگەڕێتەوە کە بەسەر ئەم شارەو سنورەکەدا هاتووە، لەکاتێکدا ئەم شارە بووە بەبەشێك لەوململانێیانە.

ناوچەی کەرکوك ئەو شوێنانە دەگرێتەوە، دەکەونە نێوان چیای زاگرۆس و ڕووبارەکانی زێی بچووك و دیجلەو زنجیرە

تەپۆلکەکانی حەمرین و ڕووباری سیروانەوە. ئەم ناوچەیەش هەمان ئەو ناوچەیەیە، لەکاتی ساسانییەکاندا بەگەرمەکان، واتە وڵاتی گەرم ناسرابوو.[1]

کەرکوک دەکەوێتە سەر هێڵی پانی(٣٥-٢٨)° باکورو درێژی(٤١-٤٥)° ڕۆژهەڵاتی هێڵی گرینج ، ناوەندی بەرزی ڕووی خاکەکەی لەسەرئاستی ڕووی دەریاوە(٣٥٠م)ە[2].

لەقاموسی ئیعلامی تورکیشدا، سنوری کەرکوک، بەم شێوەیە هاتووە(کەرکوک دەکەوێتە ویلایەتی موسڵی کوردستان،(١٦٠کم) لەباشوری ڕۆژهەڵاتی شاری موسل، چەند گردو تەپۆلکەیەکی تیادایە، لەتەنیشتییەوە دۆڵێکی فراوانی هەیە بەدۆڵی(ئەدهەم) ناسراوە. لەڕۆژهەڵاتەوە سەنجەقی سلێمانییە، لەباکورەوە کۆیەو هەولێر، لەڕۆژ ئاواشەوە سەنجەقی موسڵو بەغداش دەکەوێتە بەشی باشوری ڕۆژئاوایەوە، لەبەشی باشوری ڕۆژهەڵاتەوە قەزای سەلاحییە(کفری)، کەرکوک پێکهاتووە لەپێنج ناحیە، ئەوانیش(مەلحە، توزخورماتوو، ئاڵتون کۆپری، گێل، شوان، لەگەڵ ٢٦٢گوند).[3]

---

[1] پ.د.ئازاد نەقشبەندی: کاریگەری نەوتی کەرکوک لەسەر ڕاگوێزانی کورد لە کەرکوکو بەعەرەب کردنی، ل٢٢.

[2] وەرگیراوە لە: پشتیوان حسێنو کارزان کەریم: بایەخی جیۆپۆلەتیکی پارێزگای کەرکوک، گۆڤاری کەرکوک. ژمارە(١)ی ساڵی شەشەم، هاوینی ٢٠٠٤، ل١٠.

[3] شمس الدین سامی: قاموس ئیعلام، ص٣٨٤٨.

ئینسکلۆپیدیای ئیسلامیش(دائره المعارف الاسلامیه) سنوری ناوچەی کەرکوکی بەم جۆرە دەستنیشان کردووە: (رووباری زێی بچوك لە باکوری رۆژئاوایەوە، چیای حەمرین لەباشوری رۆژئاواوە، رووباری دیالە(سیروان) لەباشوری رۆژهەڵات و چیای زاگرۆس لەباکوری رۆژهەڵاتەوە.)[1]

(محمد هادی دفتروعبدالله حسن) لەبارەی سنوری کەرکوکەوە دەڵێن: "لەسەرەوە هاوسنورە لەگەڵ زێی بچوك، دەست پێدەکات لەگوندی(کیتکە)وە، درێژ دەبێتەوە لەگەڵ هێڵی سنوری رووبارەکە بۆ سەرچاوەی زێیەکە لە رووباری(دیجلە)، لەرۆژئاواشەوە هاوسنورە لەگەڵ رووباری دیجلەدا سنوری ئەم هێڵە لەسەرچاوەی زێی بچوکەوە لەرووباری دیجلەوە دەست پێدەکات هەتا (فەتحە)، ئینجا لەڕووی زنجیرە تەپۆلکەکانی حەمرینەوە درێژ دەبێتەوە هەتاخاڵی(عین خالد)و(عین نخیلە) لە ناوەڕاستی تەپۆلکاییەکانی حەمرین لەسەر رێگای کەرکوك تکریت، لەخواریشەوە هاوسنورە لەگەڵ هێڵی سنووری(عین خالد)و(عین نخیلە) هەتا گردی(مغارە) کە کەوتووەتە لای دەستە راستی دۆڵی(کۆردەرە)، کەزەوییەکانی حەویجە دەبڕێت بەهێڵێکی راست لێی دەشکێتەوە بۆ ناوچەیەك پێی ئەوترێت(طقان طوقان)، بەدرێژبوونەوەی بەسنوری جیابوری نێوان هەریەکە لە(داقوق)و(قەرەحەسەن)دا دەڕوات بە سەرووی

---

[1] وەرگیراوە لە:پ.د. ئازاد نەقشبەندی: کاریگەری نەوتی کەرکوك لەسەر راگوێزانی کورد، ل٢٢.

گوندی(ضویلعة)،گوندەکانی(مەتارە)و(عین حاجی)و(جەمیلە) لەلای قەرە حەسەن بەجێدەهێڵن کە کۆتایی دێت لەشوێنی یەکگرتنی رووباری(سلوهان)و(رۆخانە) کە سەر بەدۆڵی رۆخانەیەو سنورەکەی لەگەڵ دەست پێدەکات لەدۆڵی رۆخانەوە دەست پێدەکات کەسنورەکەی خواری قەزای چەمچەماڵە، لەخوارووی گوندی(قەرەوەیسی)کۆتایی دێت، لەدوایدا سنورەکەی بەرزدەبێتەوە بەرەو سەروو بەهێڵێکی راست، کە گوندی(باشیولا)، لەلای دەستە چەپییەوە بەجێدەهێڵێت لەناحیەی(قەرەحەسەن) یەکەمیان بەلای چەمچەماڵو دووەمیان بەلای ناحیەی قەرەحەسەن بەجێدەهێڵێت، لەدۆڵی رووباری خاسە لەخواروی دێی(کوراك) کۆتایی دێت، ئینجا(یەختەخان) لەوێوە بەرزدەبێتەوە بۆ سەرو بەشێوەیەکی بەردەوام هەتا کۆتایی رووباری زێی بچوك لە تەنیشت گوندی(کتیك)."[1]

(عبدالمجید فهمی)ش لەبارەی سنوری کەرکوکەوە دەڵێت:

لەبەشی باکورەوە لیوای ئەربیلو بەشێك لە لیوای سلێمانی، لە رۆژهەڵاتەوە بەشێك لە لیوای دیالە، لە باشوورەوە لیوای دیالە، لە رۆژئاوایشەوە لیوای بەغداو بەشێك لە لیوای موسل"[2].

---

[1] العراق الشمالي، الجزء الأول، بغداد-١٩٩٦، ص٢٤١-٢٤٢.

(٢) عبدالمجيدفهمي حسن: مشاهير الالوية العراقية، (موسوعة تبحث في اهم الشؤن بلادنا و احوالها الطبيعية والاقتصادية والاجتماعية والادارية والثقافية والعمرانية والتاريخية)، الجزء الثاني مطبعة دجلة، بغداد، ١٩٤٧. ص ٢

(مامۆستا کەریم زەند)یش بەم شێوەیە باس لە سنووری کەرکوك دەکات و دەڵێت: "لەباکوری ڕۆژئاوایەوە ڕووباری زێی بچووك، لەرۆژئاوایەوە چیای حەمرین. لەبەشی ڕۆژهەڵات و باکوریەوە سنورەکانی دیالەو ڕووباری سیروان پاشتر سنوری سلێمانی و چیاکانی سەگرمە."[1]

(جەلال ئەمین بەگ)یش لەبارەی سنوری جوگرافی کەرکوکەوە بەم شێوەیە دەنوسێت و دەڵێت: "سنورەکەی لەباکورەوە پارێزگای هەولێرە، لەرۆژهەڵاتیشدا سلێمانی. بەشێك لەپارێزگای دیالەو چیای حەمرین لە باشوریدا."[2]

بەمجۆرە دەبینین لەکۆنەوە تا ئەمڕۆ، بەپێی جیاوازی سەردەم و قۆناغە مێژووییەکان و بەپێی جیاوازی ڕاوبۆچون و تۆمارەکان، سەبارەت بەسنوری جوگرافی کەرکوك و دەوروبەری، هەندێك جیاوازی تێدا بەدی دەکرێت، بەڵام ئەو جیاوازییەکەمانە هیچ کاریگەرییەکی وەها ناکاتە سەر پێکەو سنوری ئەم شارە لەچوارچێوەی کوردستاندا.

### سنوری جوگرافی کوردستان:

بۆ زیاتر پشت ئەستورکردنی توێژینەوەکەمان و جەخت کردنەوەی زیاتر لەسەر ئەو ڕووبەرەی کوردستان کە زۆر زیاتر دەکەوێتە باشورو ڕۆژئاوای شاری کەرکوکەوە هەوڵ دەدەین

---

[1] کوردستانی پەرتکراو، ل١١٦.

[2] جوگرافیای کوردستان، سلێمانی-١٩٩٨، ل ١٨٤.

پشت ببەستێن بەراوو بۆچوونی جیاواز سەبارەت بەسنوری کوردستان پێش هەموو شتێك لەدیدوو بۆچوونی رۆژئاواییی و بیانی و عەرەبەکانەوە پاشان لەدیدوو بۆچوونی کوردەکانەوە.

کورد یەکێکە لەمیللەتە هەرە کۆن و نەژادە نیشتەجێکانی رۆژئاوای ئاسیا، پەیدابوونی کورد لەسەرشانۆی مێژوو زۆر کۆنترە، بۆنمونە لەپەیدابوونی گەلانی تورك و عەرەب، هیچ گومانێك لەوەدانییە، کە کوردەکان لەسەرجەمی رووداوە گرنگە سەربازی و سیاسی و کلتورییەکانی ئیمپراتۆرە مەزن و بەناو بانگەکان و دەوڵەتە گەورەکانی ئەم سەردەمەی دنیای رۆژهەڵاتدا بەشدار بوون، لەسەدەی کۆنە کانیشەوە خاکی کوردستان کەوتووەتە نێوەندو بەیەك گەیشتنی دوو یان چەند دەوڵەتێك(رۆمانی،بیزەنتی، خەلیفایەتی عەرەبی،ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی، دەسەڵاتدارێتی ئێران..........هتد)ەوە. هەمیشەش بەناتەواوی و پارچە پارچەیی خراوەتە سەر یەکێك لەم دەوڵەتانە[1].

کوردستان دەکەوێتە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و رۆژئاوای ئاسیا[2] لەنێوان هێڵەکانی پانی(٣٩°-٤٠°) باکور واتا(٩,٧٨ هێڵ) ـــــــ لەنێوان هێڵی درێژی(٦١-٥٢)ە رۆژ هەڵاتندا[3].

---

[1] چەند وتارێکی کوردناسی. ئەنوەر قادر محمد لەرووسیەوە کردویە بەکوردی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی-٢٠٠٤. ل ٩٤-٩٧.

[2] د.عبدالرحمان قاسملو: کردستان والأکراد، لبنان-بیروت.ص١١-١٢.

[3] د.عبدالله غفور:- جوگرافیای کوردستان. ل١٥.

(ئـــادەم ســـۆن) لـــەبارەی هەرێمـــە کـــورد نـــشینەکانەوە دەڵێـت:"ســنوری ئەوپــەڕی کوردســتان دەگاتــە ئەرمەنــستانی سۆڤیەتو سنوری باشوری کوردستان دەگاتە خانەقین لەعیراقدا، لەئێرانیشدا تا کرماشان درێژ دەبێتەوە. بەم پێیە رووبەری نێوان باکورو باشوری کوردستان زیاتر لە(٦٢٠کم)ە، لێرەدا بەپێی بۆچوونی (ئادەم سۆن) لەبارەی سنوری کوردستانەوە، کەرکوك دەکەوێتە ئەوسنورەی کە دەستنیشانی کردووە."[1]

(میخائیل.س.لازارێف) بەم شێوەیە ئاماژەی بە سنوری کوردستان کردووە: کوردستان ناوجەرگەی چوارکوچکەیەکە، لەسەروی رۆژئاواوە دەریای رەش‌و لەخواروی رۆژئاواشەوە تانزیکی دەریای ناوەڕاست، لە سەروی رۆژهەڵاتو خواروی رۆژهەڵاتەوە تانزیکی دەریای قەزوین‌و کەنداوی فارسی درێژ دەبێتەوە.[2] هەرچەندە ئەم سنورەی لازارێف دەستنیشانی کردووە زیادە رۆیی تێدایە، بەڵام هەرچۆنێك بێت ئەگەر باری ناوەندیشی وەرگرێت، سنوری کوردستان زۆر دەکەوێتە بەشەکانی باشورو رۆژئاوای کەرکوکەوە.

(دبلیو.ئار.های) لە بارەی سنوری کوردستانەوە دەڵێت:" بەشێوەیەکی گشتی هەموو ئەو زەوییانەی دەکەونە رۆژهەڵاتی دیجلەو باکوری هێڵی نێوان مەندەلی‌و رێڕگەی زێی بچوك،

---

[1] وەرگیراوە لە: پشکۆ حمە تاهیر راپەڕینی کەرکوك، ل ٢٤.

[2] چەند وتارێکی کوردناسی. ئەنوەر قادر محمد لەڕووسییەوە کردویە بەکوردی، ل٩٦.

نیشتمانی کوردان پێکدەهێنن، هەرلەم میانەشدا گرنگترین مەڵبەندەکانی خواروی زێی بچوک کەرکوک‌و سلێمانییە."[1]

(س.ج. ئەدمۆنز )لەبارەی سنوری کوردستانەوە دەڵێت:"لەباکور بەگشتی ئەم سنورە هێڵێکە بە یەریڤان‌و ئەرزرۆم‌و ئەرزنجاندا تێدەپەڕێت‌و لەوێوە لاردەبێتەوە لەمەرعەش روولە حەلەب دەکات، لەباشوری رۆژئاوا بەبناری چیاکاندا دەچێتە پێش تادەگاتە دیجلەو لەوێوە شان بەشانی رووباری دیجلە دەچێتە خوارێ هێندێك زیاتر لەباکورەوە بەهێڵی کێوە سور(جبل حمرین)دا روو لەناوچەیەکی سنوری نێوان ئێران‌و عێراق لەنزیك مەندەلی دەکات:"[2] لەنەخشەیەکی هۆڵەندیشدا کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی(١٧٨٠ز)، بەناونیشانی(پێنج نەخشەی وڵاتانی جیاواز)، لەمۆزەخانەی دەریایی ئەمستەردام دانراوە، لەم نەخشەیەدا ناوی کوردستان بەپیتی(C)نوسراوە(Curdistan)، تیایدا کەرکوك کەوتووەتە نێو سنوری خاکی کوردستانەوە[3]

---

[1] سنتان في كردستان. ت. فؤاد جميل، جزء الأول، بغداد- ١٩٧٣، ص ٥٨.

[2] کورد تورك عەرەب، ل ١٩.

[3] بڕوانە پاشکۆی ژمارە(١و٢)، لە گۆڤاری خاك، ژمارە(٩٢) ساڵی هەشتەم، شوباتی-٢٠٠٥،لە ل٢٨-٢٩وەرگیراوە.

(ئبين خەلدون)یش تەپۆلکەکانی حەمرین، کە ئەو بەچیای عیراق(بارمایان یان باریا) ناوی بردوون دەڵێت:"شوێنی نیشتەجێ بوونی کوردەکانە".[1]

(عبدالرزاق الحسنی )دەڵێت:" هەرێم و شارو گوندەکانی کورد لە عێراق، لە سنورەکانی عێراق-ئێرانەوە دەست پێدەکات، بە هێڵێکی ڕێك، تاوەکو تەپۆلکەکانی حەمرین(جبل حمرین)و پاشان چیای سنجار."[2]

(فائق سامرائی)یش دەربارەی سنوری کوردستان دەڵێت:"زنجیرە چیاکانی حەمرین، کە دەیان میل دەکەوێتە باشوری کەرکوکەوە، سنوری کوردستان لەباشورەوە پێك دەهێنێت[3].

(مەحمود دوورە) لەکێشانی سنوری باشوری کوردستان، ڕونکردنەوەی زیاتر دەخاتە بەردەست و وای بۆدەچێ:"ئەو سنورە لەپیشخابورەوە تازێی گەورە دەست پێدەکاو لەهەولێرەوە لەباکور، تامەندەلی لەوپەڕی باشور درێژ دەبێتەوەو لەم هێڵەدا هێندێك پواز(جیوب) هەیە، هەندێکی کوردییەو بۆ ڕۆژئاواپەلدەهاوێ و هێندێکی عەرەبییەو بەرەو ڕۆژهەڵات درێژ بووەتەوە،...لەباشوری کەرکوکیشەوە هێڵی جیاکەرەوەی خاکی

---

[1] مقدمة، المجلد الأول، دار الكتاب المصري- قاهرة-١٤٢٠هـ/١٩٩٩م، ص ١٢٠.

[2] العراق قديماو حديثاً،ص ٣٧.

[3] وەرگیراوە لە: کامل صالەیی: موجز في التاريخ كركوك، كركوك- ٢٠٠٥،ص١٠.

کوردستان لەخاکی عەرەبستان بەرەو: داقوق، دوز، کفری، خانەقین و مەندەلی دەردەکەوێ."[1]

(د.فاضل حسین)یش لەڕەوتی باسکردنی هەرێم و کوردستاندا دەڵێت:"کۆمسیۆنەکە چووە سەر ژمارەیەکی زۆر نەخشە عەرەبییەکان و سەدان نەخشەی دێرینی نێوان سەدەی شانزەیەم و بیستەم و سەفەرنامەکانی خوێندنگە ناوەندییە عەرەبییەکانی میسر، لەئەنجامدا کۆمسیۆنەکە گەیشتە ئەو ئەنجامەی، سێ ناوچەی دیار هەیە.

١. عێراقی عەرەب نشین.

٢. جەزیرە

٣. کوردستان عیراق لەباکورەوە لەهیت یان تکریت، یان لەناوچەکانی تەپۆلکەکانی حەمرین(جبل حمرین) تێپەڕ نابێ."[2]

بەلام مێژوو نوسانی عەرەبیش کاتێک زاراوەی(عێراقی عەرەبی)یان(عێراقی عەجەمی)یان بەکارهێناوە، هێما نەبووە بۆ قەوارەیەکی سەربەخۆی دیاریکراو، یان دەوڵەتێکی خاوەن سنور. بەڵکو تەنیا وەکو زاراوەیەکی جوگرافیای بەکاریان هێناوە

---

[1] وەرگیراوە لە :جوگرافیای هەرێمی کوردستانی عێراق، دانانی کۆمەڵێك مامۆستای زانکۆ، چاپی یەکەم، هەولێر- ١٩٩٨، ل١٧.

[2] وەرگیراوە لە:جەزا توفیق تالیب: دەستنیشانکردنی سنوری هەرێمی کوردستانی عێراق، سلێمانی-٢٠٠٤، ل ٢٥.

کەسنوری باکوری لەشاری تکریت سەری نەکردووە.[1] هەر لەمیانەی ئەم باسەدا هەوڵ دەدەین بەدیدو راوبۆچوونی کوردەکان لەبارەی سنوری جوگرافی کوردستانەوە بخەینە روو،(شەرەف خان) لەشاکارە بەناوبانگەکەیدا، لەساڵی(١٠٠٥ك-١٥٩٦ز) نوسراوە، دەربارەی سنوری کوردستان دەڵێت:" سنوری کوردستان بەهێڵێکی راست لەکەنداوی فارسەوە دەست پێدەکات تابڕانەوەی(مەلاتیا)و(مەرعەش) دەچێ. بەشی باکوری ئەم هێڵە، ولاتی فارس‌و عێراقی عەجەم‌و ئازەربایجان‌و ئەرمەنستانی بچوکە، باشوریشی عێراقی عەرەبی‌و ناوچەکانی موسڵ‌و دیاربەکر دەگرێتەوە."[2] هەرچەندە ئەم دەستنیشانکردنی سنورەی شەرەفخانی بدلیسی دیاری کردووە، دەستنیشانکردنێکی گشتییەو تارادەیەك ناڕوونی تێدایە. بەلام وەکو سەرچاوەیەکی جوگرافی مێژوویی پشتی پێ دەبەستین.

(ئەمین قادر مینە) پێی وایە" کوردستانی باشور دەکەوێتە ناوەراست‌و باکوری رۆژهەلات‌و باکوری عیراق‌و هەموو ئەرخاکە دەگرێتەوە کە بەهێڵێکی راست لەسنوری عێراق-ئێرانەوە بەرەو رۆژئاوا دەکشێ تادەگاتە خوارووی جەسان، لەوێوە هاوڕێك لەگەڵ سنوری عێراق - ئێران بەرەو رۆژئاوای بە لەدوونو

---

[1] خەبات عەبدوڵا: بنەما تیۆرییەکانی جوگرافیای عەسکەری کوردستانی باشور، چاپی دووەم، سلێمانی-٢٠٠٥. ل٢٤٣.

[2] شەرەف نامە، وەرگێڕانی بۆ زمانی کوردی هەژار، چاپخانەی نعمان، نەجەف-١٩٧٣، ل ١٢٧

شارەبان دەڕواو لەوێشەوە بەرەو چیای حەمرین هەڵدەکشێ. ئینجا بەرەوباکوری رۆژئاوا لەگەڵ زنجیرە چیای حەمریندا دەڕوا تا دەگاتە فەتحە، لەفەتحەدا لەگەڵ رووباری دیجلە بەرەو سەر هەڵدەکشێ. هەموو ئەو زەوییانەی دەکەوێتە رۆژ هەڵاتیەوە بەرکوردستانو ئەو زەوییانەشی لەرۆژئاوایەتی بەرناوچەی عەرەبی عێراق دەکەوێ، تادەگاتە سەروی شاری موسڵ. لە سەروموسڵیشەوە هێڵێکی راست ڕوو لەباشوری رۆژئاوا دەکاتو بەخوار تەلەعفەردا تێدەپەڕێ تادەگاتە(١٠كم) باكوری شاری(بەعاج) ئینجا بەهێڵێکی راست بەرەو رۆژئاوا دەڕواتو لەگەڵ سنوری عیراق سوریا یەکدەگرێتەوە."[١]

سەنتەری لێکۆڵینەوەی کوردیش لەپاریس لەساڵی(١٩٤٦ز)دا لەسەر سنوری کوردستان بەم شێوەیە دەنوسێ و دەڵێ:"سنوری ئەم خاکەی کورد لێی ئەژی لەباکورەوە بەهێڵێك دەست پێدەکات، لەچیای کورد بەرەو باکور هەڵدەکشێ و بەناوچەکانی کیلسو مەرعەشو ئەلبیستانو دیڤریکی تێدەپەڕێ هەتا دەگاتە رووباری کەلکیت، سنوری رۆژهەڵاتی دەستپێدەکات بەهێڵێك لەفارس بەرەو باشوری رۆژهەڵاتو کەناری رۆژئاوای دەریاچەی ورمی دەبڕێ، لەدوایدا درێژدەبێتەوە بەرەو سنەو کرماشان هەتا لوڕستانو ناوچەی بەختیاری سنوری باشوری رۆژئاوا بەهێڵێك دەست پێ دەکات

---

[١] ئەمنی ستراتیژی عێراقو سێکوچکەی بەعسیان: تەرحیل. تەعریب. تەبعیس، چاپی دووەم، سلێمانی-١٩٩٩،ل ١٤٨-١٤٩.

لەباشوری لوڕستانەوە درێژدەبێتەوە بەرەو رۆژئاواو مەندەلی دەبڕێو بەرەو رۆژئاوای خانەقین تێدەپەڕێ، هەتا تەپۆلکەکانی حەمرینو هەتا پشتێنەی یەکەم لەچیای شێخان، لەدوایدا پێچ دەکاتەوە بەرەو باکور بەدرێژایی قەدی تەپۆلکەکانی هەتا فیشخابور لەسەر رێی دیجلەو لەدوایدا پێچ دەکاتەوە بۆ رۆژئاواو بەرەوچیای شەنگارو هەتا کۆتایی پێ دێت بەزێی فورات لەنزیک تەرابلوس."[1]

(د.ئازاد نەقشبەند)یش پێی وایە: "سنوری کوردستانی عێراق لەشاری بەدرەوە دەست پێدەکاتو لەوێوە سنوری بەرەو مەندەلیو شارەبانو بەتەنیشت چیای حەمرین دەڕوا تا لەدیجلە دەپەڕێتەوەو لەرۆژئاوای دیجلەوە بەتەنیشت چیای مەکحولو شەنگار دەڕوات تا دەگاتە سەرسنوری عێراق-سوریا."[2]

ئێمە لێرەدا دەتوانین لەکۆی سەرجەم راوبۆچوونەکان لەمەڕ سنوری جوگرافی کوردستان ئەوڕاستییە هەڵهێنجین کە تەپۆلکەکانی حەمرین دەبنە خاڵی جیاکەرەوەی کوردستان لەعێراقو کەرکوکیش زۆر زیاتر لەوە دەکەوێتە نێوەندی ئەو سنورەی کوردستانەوە کە ئێمە لێرەدا، لەسەرجەمی راوبۆچوونەکانی بیانیو رۆژئاواییو عەرەبو کوردەکانەوە وەرمانگرت.

---

[1] د.عبدالله غفور: جوگرافیای کوردستان. ل٢٥٢-٢٥٣.

[2] د.ئازاد نەقشبەندی: دەستنیشانکردنی سنوریکوردستان، گۆڤاری سیاسەتی دەولی(گۆڤارێکی وەرزییە سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی دەری دەکات)، ژمارە(٢)ی ساڵی سێیەم، تەموزی ١٩٩٤. ل٢٢.

بەمجۆرە ئەم سنورە جوگرافییەی ئێستای کوردستانی باشور، دەرهاویشتەی پێکهاتە سیاسییەکەی عێراقە[1] ناتوانرێت بوترێت کەرکوك شارێکی کوردنشینی تەواوەتییە، بەلآم دەبێت بوترێت ئەم شارە بەشێکە لەکوردستان[2] پێکهاتەی سەرەکی زۆرینەی دانیشتوانەکەی کوردە.

---

[1] خەبات عەبدولا: بنەماتیۆرییەکانی جوگرافیای عەسکەری کوردستانی باشور. ل١٠١.

[2] مجموعة الأكادميين العراقين: كركوك مدينة القوميات المتآخية. ص ٢٦.

# باسی یەکەم

## گۆڕانی سیستمی ئیداری دەوڵەتی عوسمانیو دروست بوونی ویلایەتی موسڵ (۱۸۷۹ز)، پێگەو بارودۆخی کەرکوك لەوگۆڕانەدا

کۆنترین دابەشبوونی ئیداری خاك لەکوردستانو وولاتانی دەوروبەردا بۆ سەردەمی دەسەلاتی(داریوشی یەکەم۵۲۰-۵۱۵پ ن) دەگەڕێتەوە، داریوش ولاتانی هاخامنشینی بەسەر چەند بەشێکدا دابەش کردبوو، بەڕێوەبەرێکیشی بۆ هەر بەشێك لەو بەشانە دانابووو نازناوی(خشسراپاون)ی پێ بەخشیبوون.[1]

[1] خەبات عەبدوڵا: بنەما تیۆرییەکانی جوگرافیای عەسکەری کوردستانی باشور، ل۲٦۹.

لەسەردەمی ساسانییەکانداو لەناوەڕاستی سەدەی سێیەمی زاینییەوە ئەو ناوچانەی سەر بەهەریەك لەشارەزوورو(بیت گرمێ) بوون، چووە نێو سنوری دەسەڵاتی ساسانییەکانەوە[1] پێدەچێت ناوچەکە لەسەردەمی خەلافەتی ئومەوییەکاندا لەلایەن والی شاری کوفەوە بەڕێوە برابێ. چونکە دورایی جوگرافی ناوچەکە هەروا هەڵدەگرێ، پاش شۆڕشی عەباسییەکانیش(١٣٢ك-٧٥٠ز)، ئەم ناوچانە بوونەتە بەشێك لەئیمپراتۆرییەتی عەباسییەکان و لەبەغداوە حوکم کراوە.[2] کاتێکیش مەغۆلەکان دەستیان بەسەر رۆژهەڵاتی ئیسلامیدا گرت، لەسەدەی(٧ك-١٣ز)، هەندێك گۆڕانکاری لەنەخشەی کارگێڕی کوردستاندا ڕوویدا، ویلایەت و گۆڕانکاری نوێ لە ناوچەکەدا هاتە کایەوە، لەگرنگترین ئەو گۆڕانکارییانەش، لەدوای داگیرکاری مەغۆلەکان لەکوردستاندا ڕوویدا، دروست بوونی ویلایەتێك یان هەرێمێك بوو بەناوی کوردستان.[3]

دەوڵەتی عوسمانیش لەڕووی کارگێڕییەوە، دابەشی چەند یەکەیەکی گەورە ببوو، کەزاراوەی(ویلایەت-Viluyat) یان بۆ هەریەکەیەك بەکار دەهێنا، ویلایەت یان(ئیالە)یش بۆچەند یەکەیەکی کارگێڕی بچوکتر دابەش ببوو، پێی دەوترا(سەنجەق

---

[1] د.جمال رەشید: کەرکوك لەچاخەکۆنەکاندا، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە(٢٠) ، هاوینی٢٠٠٠، ل٦٣.

[2] قادر محمد: ناوچەی کەرکوك لەسەردەمی عەبباسیەکاندا،ل ١٠٤.

[3] د.زرار توفیق: کردستان في قرن الثامن الهجری،(دراسة في التاریخ السیاسی والاقتصادی)، طبعةالأولی، اربیل-٢٠٠١،ص ٤٦.

Sanjuk)، یان(لیوا-Liva)، سەنجەقیش بۆ یەکەی بچوکتر دابەش دەبوو کە(قەزاکان-Kazaler) یان کەرتی خۆجێی(المقاطعات المحلیة) بوون، هەر قەزایەکیش لەشارۆچکەو گوندەکانی پێکدەهات، یان لەکۆمەڵێ دێهات(ناحیە Nahiye)ی پێدەگوترا. ئەویش شارۆچکەیەکی بچوك و گوندەکانی دەگرتە خۆ، سەنجەقیش هەمیشە بەیەکەی کارگێڕی بنچینەیی دەژمێردرا، بۆیە والی گرنگترین سەنجەقەکانی هەڵدەبژاردو دەیکردە ناوەندی کارگێڕی، ئەم سەنجەقانەش(سەنجەقی پاشا-Pasha Sanjaki) یان پێ دەوترا، ئەو والییەی کە کاروباری ویلایەتی پێ سپێردرابوو پێی دەوترا(بەگلەر بەگی-Baylerbeyi)* واتە بەگی بەگەکان، پلەوپایەی( میری میران Miran Mer) یان هەبوو کەزاراوەیەکی فارسییەو لەکوردیشدا هەمان واتا دەگەیەنێ و بەو واتایەی سەرۆکایەتی میری سەنجەقەکانی سەر بە ئەیالەتەکەی دەکات. ئەوانەی دوایش پێیان دەوترا (سەنجەق بەگی-Sanjakbeyi) واتە بەگی لیوا ئەمانە پلەی(میرلیوا) یان هەبوو، ئەمەش وشەیەکی فارسییەو واتای سەرۆکی لیوا دەبەخشێت. سەنجەق بەگ لەقەزای ناوەندی سەنجەق دادەنیشێت و قەزاکانی دیکە لەلایەن دادوەر(صوباشی)یەوە بەڕێوە دەچوو، کاروباری ناحیەو

---

* بگلربگی-Baylerbeyi:- زاراوەیەکی تورکییەو بەواتای بەگی بەگەکان دێت و ئەمە بۆلەقەبی پاشا لە پلەیەکی بەرزدا، یان بۆحاکمی ئەیالەت بەکار دەهات.(لونگریك: اربعه القرون.. ص٣٦٨).

گوندەکانیش لەلایەن ئەو کەسانەی پێیان دەوترا(کتخدا-کوێخا) بەڕێوە دەچوون و ئەمانەش بەشێوەیەکی ئاسایی لە گەورەی ئەوگوندانە پێکدەهاتن و جێگەی باسە هەمان ریزبەندیو ڕێکخستنی ناوبراویش لەسوپادا پەیڕەودەکرا، چونکە دەوڵەتی عوسمانی بەحوکمی مۆرکە شەڕانگێزییەکەی لەیاساکانیدا هەردوو لایەنی کارگێڕیو سەربازی پێکەوە گرێ دەدا.[1]

لە سیستەمی کارگێڕی دەوڵەتی عوسمانیدا، (ئەنجومەنی ویلایەتەکان) هەبوو ئەو ئەنجومەنانە لە ئەندامە ئاساییەکان پێکهاتبوو، ئەویش بەپێی پلەو پایەیان، واتە لە فەرمانبەری بالادەستی ویلایەتەکە بەسەرۆکایەتی (والی)و دواتر: جێگری والیو دەفتەرداروو قائیمقامو نووسەرانو موفتیو ئەندامە هەڵبژێردراوەکانی، کە ژمارەیان (٤-٩) ئەندام بوون هەروەها چەند کەسانێك لە ویلایەتەکاندا نوێنەری تایفە ئاینیە جۆر بەجۆرەکان بوون، بەڵام لەو ویلایەتانەدا (هەر سێ ویلایەتەکەی موسڵو بەغداو بەسرە) ئەنجومەنی کارگێڕی لیواکە، بە سەرۆکایەتی موتەسەریفو جێگرەکەیو ژمێریارو بەڕێوەبەری تەحریراتو ٤ ئەندامی هەڵبژێردراوی مەدەنی بوو، لە قەزاکانیشدا، ئەنجومەنی کارگێڕی قەزا کە قائیمقام سەرۆکایەتی دەکردو دوای ئەم ئەندامانی مودیر مالو بەڕێوەبەری

---

[1] د.ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر، سەعدی عوسمان حسێن: کوردستانی باشور لەسەدەکانی ١٧و١٨دا، گۆڤاری سەنتەری برایەتی ژمارە (٢٣)، بەهاری ٢٠٠٢، ل٧٠.

تەحریرات و موفتی و ئەندامە هەڵبژێردراوە مەدەنییەکان، کە ژمارەیان (٤) ئەندام بوو، لە هەمان کاتدا دەگونجا ژمارەی ئەندامانی ئاسایی و ئەندامە هەڵبژێردراوەکان بەپێی ویلایەتەکان و لیواکان و قەزاکان زیادو کەم بکرێت، ماوەی بەستنی ئەنجومەنی ویلایەتەکان یان لیوا لە (٤٠) ڕۆژ زیاتر نەبوو، کە لە ماوەی ساڵێکدا جارێك کۆدەبوونەوەو والی گوێی لە ئەندامانی ئەنجومەن و بۆچوون و پێشنیارکراوەکانیان دەگرت، بەڵام مەرج نەبوو ئەوانەی، کە دەخرێنە بەردەستی والی هەستێت بەجێبەجێ کردنیان، شایانی باسە ئەندامە هەڵبژێردراوەکان بۆ ئەو ئەنجومەنی ویلایەتانە یاخود لیوایانە، بە شێوەیەکی گشتی لە چینی خانەدان و دەوڵەمەندەکان بوون، چ لەناو هەر سێ ویلایەتەکەدا یان لە لیوا یان لە قەزاکاندا بووبێت زۆربەی ئەو ئەندامی ئەنجومەنانە بەبێ ئاگا دڵسۆزییان بۆ والی و فەرمانبەرە باڵادەستەکان و موتەسەریف دەنواندو چیان بوتایە بەگوێیان دەکردن و جێبەجێیان دەکردو لارییان لەسەر فەرمانەکانی ئەوان نەدەنواند، ئەمەشیان لەبەر پاراستنی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بوو، نەوەکو دەست بەسەر بەرژەوەندییەکانیاندا بگیرێت یان بەرژەوەندییەکانیان بکەوێتە مەترسییەوە[1].

پاش جەنگی چاڵدێران و بەتایبەتی لەساڵی (١٥١٦ز) دا، موسڵ کەوتە ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکان، لەپاش ئەم دەست

---

[1] عبدالخالید سابیر، ویلایەتی موسڵ لە ساڵنامەی عوسمانیدا، گۆڤاری هەزار مێرد، ژمارە (٢٦)ی ساڵی هەشتەم، ل ١١٩ - ١٢٠.

بەسەرا گرتنە، موسڵ بوو بەلیوا(سەنجەقێکی) عوسمانی. سەر بە ویلایەتی دیاربەکر لەبەڵگە نامەیەکی عوسمانی ساڵی (١٥٣٩-١٥٤٠ن)دا سنوری ویلایەتی موسڵی ئەوکات بەم شێوەیە دیاری کراوە، ویلایەتی دیار بەکر لەباکور، ویلایەتی شارەزوور لەرۆژهەڵاتو ویلایەتی بەغدا لەباشور، ویلایەتی(ریقە) لەرۆژئاوا.[1] موسڵی کۆنو سلێمانیو کەرکوك پێیان وتراوە(شارەزوور). ئەم ویلایەتانەش لە لایەن پادشا لە بەغدا بەڕێوە براوە.[1] لەساڵی (١٦٣٩ز) وە سەفەوییەکانو عوسمانییەکان رێکەوتن نامەی(زەهاو)یان لەبارەی دیاری کردنی سنوری هەردوو لاموّرکرد، هەر لەو کاتەوە تاوەکو ساڵی (١٨٧٩ن) گۆڕانکاری زۆر بەسەر ویلایەتی موسڵدا هاتووە، سەردەمێ تەنها سەنجەقێك بووەو بۆماوەیەکیش بەتایبەتی لەساڵی (١٧٢٦ن)دا ناوچەکەو دەوروبەری لەژێر دەسەڵاتی والییەکی عەرەبدا بووە،[2] ئەم ویلایەتە(ویلایەتی موسڵ)، تاوەکو ساڵی (١٨٧٨ن) بە ویلایەتی شارەزوور ناودەبرا، کەرکوکیش مەڵبەندی ئەم ویلایەتە بووە،[3] لەسەدەی هەژدەشدا

---

[1] سەلام ناوخۆش: هۆکارەکانی لکاندنی ویلایەتی موسڵ بەعێراقی عەرەبییەوە، چ.یەکەم، کوردستان - ٢٠٠٠، ل٧٤-٧٥.

[1] Habibolah Atarodi: Great Powexs,Oil And The Kurd In Mosul: Univresity Press OF America-2003, Pxiv

[2] د. فاضل حسين: مشكلة الموصل. ص ١٠٥.

[3] د.نوری تاڵەبانی: وویلایەتی موسڵ لەلایەن ئینگلیز لکێنرا بە دەوڵەتی عێراقەوە. گۆڤاری کەرکوك. ژمارە(٢)ی ساڵی پێنجەم، پایزی ٢٠٠٣. ل٨.

کەرکوک ناوەندی(مەرکەزی) ئەیالەتی شارەزوور بووە، دابەش کرابوو بەسەر سێ لیوادا، ئەوانیش لیواکانی کەرکوک و هەولێرو سلێمانی. سەنجەقی موسڵ قەزاکانی(دهۆك، زاخۆ، زێبار، سنجار، ئاکرێ)ی دەگرتەوە، بەلام سەنجەقی شارەزوور(کەرکوك)، گەورەترین سەنجەقی ویلایەتی موسڵ بوو لەپێکهاتەو ژمارەی ناحیەو گوندەکانیدا، پێکهاتبوو لە(٦قەزاو)(١٧ناحیەو) (١٧١٢گوند)،[1] سەرهەڵدانی ئەم ویلایەتەش بۆ رێکخستنەوەی پارچەکانی ئەمارەتی(میرنشینی) شارەزوور بوو، کەپێشتر لەژێر دەسەلاتی ئەردەلانییەکاندا بوو. دەسەلاتی عوسمانییەکان لەم ویلایەتە شێوەیەکی رووکەشی هەبوو، دەسەلاتی راستەقینە بەدەستی میری ئەردەلانەکانەوە بوو، ئەومیرانەی لەسەر شێوازی کۆن فەرمانڕەوایی میرنشینەکەیان دەکرد هەروەکو ئەوەی لایەنگری عوسمانییەکان نین.[2] هەر لەم بارەیەوە لەئینسکلۆپیدیای ئیسلامی دەربارەی ناوچەی کەرکوك، دەوروبەری تیایدا هاتووە:"دەسەلاتی راستەقینەی ئەم ناوچەیە لەسەرۆکە کوردە خۆجێیەکانی میرنشینی ئەردەلان بوون، دەسەلاتی عوسمانی دواتر توانی

---

[1] د.جبار قادر: السیاسات الحکومیە بحق الکرد فی کرکوك خلال عهد الملکی، گۆڤاری کەرکوك ژمارە(١٤) پایزی-٢٠٠٢، ل ١٨٨.

[2] وەرگیراوە لە: نەژی: مێژووی سەرەدەمە کارگێڕی و بەڕێوەبەرییەکانی ناوچەی کەرکوك، گۆڤاری کەرکوك ژمارە(٤)ی ساڵی دووەم، بەهاری٢٠٠١-ل٤٢.

بەپشت بەستن بەچالاکی میرەکانی شارەزوور دەسەلاتی خۆی بەسەر ئەم شارە(شاری کەرکوک) بسەپێنێت[1].

سەنجەقەکانی ئەم ویلایەتە هەردەم لەگۆڕانی زۆرو کەمدا بووە کەپاشتر بەشێکی زۆری بەر بابانەکان کەوتووە.[2] لەسالی (١٨٠٩ز)دا ناوچەی شارەزوورو سلێمانی لەژێر فەرمانڕەوایەتی یەکێك لەمیرەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا پەنای بردۆتە بەر(فەتح عەلی شا)، ئێرانیش بەردەوام لەسەر ئەم ناوچەیە لەگەڵ دەربارەی عوسمانیدا لەمشتومڕو ناکۆکیدا بوو، بەلام ئەم ناوچەیە وێڕای داگیرکاری(محمد علی میرزا)یش لەکۆتایدا کەوتەوە ژێر قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانی،[3] لەدوای گواستنەوەی بنکەی ویلایەتەکە بۆشاری کەرکوك، گۆڕانکاری گرنگ لەمێژووی ویلایەتەکەدا ڕوویدا، ئەمەش ئەوە روون دەکاتەوە کە تەنها گرنگی ئەم ویلایەتە، لەدەست بەسەراگرتنی دەروازەکانی چیادا نییە، لە سنورەکانی لەگەڵ ئێراندا، بەڵکو روانینە بەسەر ناوچە فراوانە دەشتییەکانی شارەزووردا، ئەم دەشتاییە، سەرەکیە بۆ ناو هەردوو وویلایەتی بەغداو موسڵ، بۆیە دەبینین گرنگی ئەم وویلایەتە لەڕووی سەربازییەوە بۆ

---

[1] وەرگیراوە لە: پ.د. ئازاد نەقشبەندی: کاریگەری نەوتی کەرکوك لەسەر راگوێزانی کورد، ل٢٣.

[2] ئەژی: مێژووی سەردەمە کارگێڕیو بەڕێوەبەریەکانی ناوچەی کەرکوك.ل ٤٣.

[3] حەسەن ئەرفەع: کوردەکان(لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسی)یە، و. سەردار محمد، سلێمانی-٢٠٠١. ل٤٢.

دەوڵـەتی عوسمـانی زیـاتر بـەرگری کـردن بـوو، لـەوەی ببێتـە ناوەندێکی هێرش کـردن، وەك سیستمی باوی دەرەبەگایـەتیش لــەماوەی ســەدەی شــانزەهەمدا ویلایەتەکــە دابــەش کــرا بۆ(٢٠سـەنجەق)، لەناوەڕاستی سـەدەی هەڤدەمیشدا کرابە(٣٢) سەنجەق، زۆری سەنجەقەکان بەقەڵاو دەروازەی گرنگ پارێزراون، چونکە شوێنی بڵاوبوونـەوەی هۆزایـەتی و هەرەشـەی بـەردەوامی ئێرانییەکانی لەسەر بووە، هەرچەندە ئەمڕۆ ناوی سـەنجەقەکانی شارەزوور بەتـەواوی نازانرێت بـەڵام بـەپێی ئـەو بەڵگانـەی هەیـە سەنجەقەکانی شارەزوور بریتییە لە(کەرکوك شوێنی(پاشا)بووە، هەولێر، هـەریر، کۆیـە، شـەمامك، مـەخمور، ئـەبورمان، ئەوشـتی، باف، برنـد، بلقاس، بیل، شهرباز، شهرزوور، عجورقلعە، غازی، کشان، مرکاوە، مهربان، هـەزارمێرد، رۆدێـن، شـەمێران، قـەرەداغ، جاغان،قزڵجە، بیە، زەنکە، ئـەنجیران)، [1] لەسـاڵی (١٨٦٤ز) دا لـە ژێـر رۆشـنایی یاسـاکانی فەرەنـسیدا، دەرچـووە*،بەمەبەسـتی رێکخستنی کـارگێڕی هەرێمـەکان و بەسـتنەوەیان بەسـەنتەرەوە، لــەکانونی یەکــەمی ســاڵی (١٨٧٠ز) دا یاســای کــارگێڕی

---

[1] ئەژی: مێژووی سەردەمە کارگێڕی و بەڕێوەبەرییەکانی ناوچەی کـەرکوك، ل٤٢-٤٣.

* کاربەدەستانی عوسمانی هەرێمەکانی ژێر دەسەڵاتیان دابەش کردبوو بۆ چەند قەوارەیەکی ئیداری، ویلایەت، سەنجەق، قەزا، ناحیە یاسای کارگێڕی فەرەنــسایش بەهــەمان شــێوەبووە.(کــوردو کوردســـتان: ن. کۆمــەڵێك لەپسپۆڕان و ئەفسەرانی ئینگلیز، و حسێن و عثمان حسێن احمد، چ یەکەم، هەولێر ٢٠٠٢، ل١٠)

ئەیالەتەکان لەسەر بنەمای یاسای نوێ دەرچوو، بۆئەم مەبستەش مەدحەد پاشا، هەستا بەڕێکخستنی کارگێڕی نوێی ویلایەتەکان لە سەرتاسەری عێراقدا، لەنێوان ساڵانی (١٨٦٩-١٨٧٢ن)[1] مەدحەد پاشا هەوڵی هێنانەکایەی کۆمەڵێك چاکسازی پێویستی داو هەوڵیدا بۆ دانانی دەستوورێك بۆبەڕێوەبردنی لەساڵی (١٨٧٦ن) دا.[2]

لەسەردەمی مەدحەد پاشادا، جارێکی دیکە موسڵ دەبێتەوە بەوویلایەتو ئەوسا سنوری وویلایەتی موسڵ بەمجۆرەی لێ دێت: وویلایەتی دیاربەکرو وان لەباکور، مەملەکەتی فارس لەرۆژهەلآت، سەنجەقی(دیرالزور) لەرۆژئاوا، ویلایەتی بەغداش لەباشوور سنوری بووە[3]، ئەمانە لەکاتێکدا عێراقی ئێستا لەو سەردەمەدا دابەش ببوو بۆ سێ ویلایەت ئەوانیش ویلایەتەکانی موسڵو بەغداو بەسرە بوون وهەر ویلایەتێکیش ژمارەیەك سەنجەقو قەزاو ناحیەی دەگرتەوە.[3]

---

[1] د.کمال مظهر احمد: کرکوك وتوابعها، ص٣٩.

[2] عبدالوهاب الکیالی: موسوعة السیاسیة، طبعة الأولی، بیروت-لبنان، مارس١٩٧٤، ص٧٥.

[3] وەرگیراوە لە: سەلام ناوخۆش: هۆکارەکانی لکاندنی وویلایەتی موسڵ.... ل٧٧.

[3] د.خلیل اسماعیل محمد: رۆڵی ڕەهەندی نەتەوەیی لەگۆڕینی سنوری کارگێڕی پارێزگای کەرکوکدا، وەرگێڕانی لەعەرەبیەوە د.جەزا تۆفیق تالیب، چاپخانەی گەنج، ٢٠٠٥، ل٣.

لەسالّی (١٨٧٩ز) دا کاتێک گۆڕانکاری لەئیدارەی ویلایەتەکاندا روویدا هەردوو سەنجەقی کەرکوک و سلێمانیش خرانە سەر ویلایەتی موسڵ، لەئاکامدا ویلایەتی موسڵ بوو بەویلایەتێکی سەربەخۆ پێکهاتە ئیدارییەکەشی پاش سالّی (١٨٧٩) بەم شێوەی خوارەوەی لێهات.[1]

| سلێمانی | کەرکوک | موسڵ | لیوا |
| --- | --- | --- | --- |
| سلێمانی-<br>گولعەنبەر<br>مەعمور- حەمید<br>بازیان<br>شارباژێر<br>جاف | کەرکوک-<br>رەواندوز<br>کۆیە-رانیە<br>هەولێر-کفری | موسڵ-<br>ئامێدی<br>زاخۆ- هۆک<br>ئاکرێ-سنجار | قەزا |

کوردستان دوای دروست بوونی ویلایەتی موسڵ لەسالّی (١٨٧٩ز) دا بووە ویلایەتێکی ژێردەستەی دەسەلاّتی عوسمانی و دەرگای هاتن و نیشتەجێبوونی تورکمانی* بۆ

[1] سەلام ئاوخۆش: هۆکارەکانی لکاندنی ویلایەتی موسڵ.... ل٧٧.

* تورکمانەکانی عێراق بەرەچەڵەک دەچنەوە سەر ئەوخێڵە کۆچەرە تورکانەی ئاسیای ناوەراست، کە لەناوچەکانی نێوان دەریای قەزوین و سنووری رۆژئاوای چین شوێنی کۆچ و کۆچباریان بووە، زۆرجاریش وشەی تورکمان بەهەموو ئەو تورکانە دەوترێت لە ولاّتانی فارس ئازەربایجان، ئاسیای بچوک(تورکیا)، سوریا، میسروعێراق نیشتەجێن، ئەوتورکانەی-

والأكـرا، داگيركـەرانى كوردسـتان دەسـت بـەجێ سـەربازو چـەندرمەو خـەڵكى سـەربەخۆيان لەشاروشارۆچـكەكانى سـەر رێگاوبان‌و هاتوچۆى گشتى نيشتەجێ كرد، چونكە كوردستان لەسـەردەمى دەوڵـەتى عوسمانيـدا رێگايـەكى گـرنگ‌و پڕبايـەخى بازرگـانى‌و هاتوچـۆى سـەربازى نێـوان هـەردوو ئيمپراتۆريـەتى عوسمـانى‌و دەسـەڵاتدارانى ئێرانـى بـووە، كـە لەشـەنگارو تەلەعفـەرو موسـڵ‌و هـەولێرو پـردێ‌و پاشـان بـەناو كـەركوك‌و داقوق‌و كفرى‌وخانەقين‌ومەندەلى تێدەپەڕى بۆ ناو ئێران لـەڕێگاى شارەكانى سەر بەسنورەوە.[1]

-لەئازەر بايجاندا نيشتەجێ بوون بەئازەربايجانى يان ئازەرى ناوبانگيـان دەركرد، ئەوانـەى لـە ئاسياى بچوك نيشتەجێ بوون بەعوسمانى ناسران‌و ئەوانەشـى تـاوەكو ئێـستا نـاوى توركمانيـان بۆماوەتـەوە توركـەكانى عێراقـە.(د.خـەليل ئيسماعيل: دابەشـبوونى جـوگرافى توركمـان لەعێراقـدا، گۆڤارى سياسەتى دەولى، ژمارە(٤)ى ساڵى دووەم، كانونى دووەمـى ١٩٩٤، ل٢٠).

* بـوونى توركمـان لەكەركوكـدا لـەپێش عەرەبەوەيـە. بـەڵام لـەپێش كوردەوەنييە. يەكەم دەركەوتنى توركمان لەكەركوك دەگەڕێتەوە بۆ سەدەى پانزەى ميلادى، پاشتر ژمارەيەكى زۆر توركمان لەهەرێمەكانى- ئەنادۆڵەوە گواسـترانەوە بـۆ زەوى هەرێمـە جياوازەكـان لـەنێوان بەغداو ئەسـتەمبوڵ، لەپێناو پارێزگارى كردن لەرێگاوبانەكان.(فريداسسرد: المسألة الكردية بعد قانون ادارة دولة العراقية. سليمانية-٢٠٠٥.ص٩١-٩٢.)

[1] محمد سعيد سۆفى: پارێزگاى كـەركوك لـەناوپاكتاوى رەگەزيدا.٢٠٠٠.ل ٢١.

هـەر لـە نووسـراوەکانی دەوڵـەتی عوسمانیـدا هەیکـەلی کارگێڕی سەنجەقی شارەزوور بەپێی ژمارەی دانیشتوان و گوندو ناحیەکانی بەم شێوەیەی لای خوارەوە هاتووە[1]:

| قەزا | ژمارەی ناحیە | ژمارەی گوند | ژمارەی دانیشتوان |
|---|---|---|---|
| کەرکوک | ٥ | ٣١٠ | ٣٠,٠٠٠ |
| ئەربیل | - | ٣٢٠ | ١٢,٠٠٠ |
| ڕانیە | - | ٤٥ | ٥,٠٠٠ |
| ڕەواندوز | ٣ | ٥٥ | ١٠,٠٠٠ |
| کفری(صلاحیە) | - | ٢٥٢ | ١٨,٠٠٠ |
| کۆیسنجق | - | ١٥٨ | ١٤,٠٠٠ |

ئـەم سیـستەمەیش هـیچ گـۆڕانێکی وای بەسـەردا نـەهات بەهۆی ئەگەرەکانی نزیکبوونەوەی جەنگی جیهانییەوە، ئەمەش لـە سـاڵنامەی عوسمانیـدا جـێگیرە، کـە بەیـەکێك لـە سەرچـاوە گرنگـەکان دەژمێردرێـت، لـەم بارەیـەوە لـە سـاڵنامەی (١٣٢٩ك / ١٩١١ن)دا هـاتووە کە سـەنجەقی کـەرکوك لـە (ئەربیل، ڕەوانـدوز، کۆیـە، ڕانیـە، کفری(صـلاحیە)) پێکهاتووە، لەگـەڵ سـەرجەم ئـەو شوێنانەی دیکە کە سەر بەم ناوچانە بوون[2].

---

[1] ستار مصطفي: کردستانیة کرکوك حسب ارقام و احصائیات غیر، گۆڤاری کەرکوك ژمارە (٤)ی ساڵی شەشەم، بەهاری ٢٠٠٥،ل ١٧٨.

[2] د. کمال مظهر احمد: کرکوك و توابعها، ص ٤١.

کاتێکیش لەساڵی (١٨٧٩ز) دەوڵەتی عوسمانی بڕیاریدا مەڵبەندی ویلایەتی موسڵ بۆ شارەزوور بگوازێتەوە. شاعیری کورد(شێخ رەزای تاڵەبانی)[*]، لەدێرە شیعرێکدا خەم و پەژارەی خۆی دەربڕیوەو خەڵکەکەشی لەمەترسییەکانی ئەم وەرچەرخانە وریا کردووەتەوە، هەروەها ناوی والییە نوێیەکەشی هێناوە پێدەچێت ناسیبێتی، چونکە پێش ئەو مێژووە (شێخ رەزا) لە کەرکوک بووە، شاعیر دەڵێت:

---

[*] شێخ رەزا کوڕی شێخ عبدولرەحمانی شێخ ئەحمەدی کوڕی مەلا مەحمودی کوڕی یوسف ئاغایە، لەساڵی(١٢٥٣ك-١٨٣٧ز) لەگوندی(قرخ) نزیك چەمچەماڵ لەدایك بووە، لەتەمەنی حەوت ساڵیەوە وەك فەقێ خوێندوویەتی لەمەدرەسەی زانای بەناوبانگ جەلی زادە لەمزگەوتی گەورەی کۆیە، لەمزگەوتی گەورەی سلێمانیش خوێندوویەتی، لەتەمەنی بیست وپێنج ساڵیدا خۆی بەخوێندنی ئەدەبیاتی عەرەبی و فارسی وتورکییەوە خەریك کردووە، سەردانی حەلەب ونەستەمبوڵ وگەلێك لەشارەکانی دیکەی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی کردووە، بەم شێوەیە ژیانی بردۆتە سەر تا لەرێکەوتی(١٠ی موحەرەمی ساڵی ١٣٢٨ك-٢٠ی کانونی دووەمی ١٩١٠ی.ز) لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە لەگۆڕستانی شێخ عبدولقادری گەیلانی بەخاك سپێردراوە .(شێخ محمدی خاڵ، دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی، چاپی یەکەم، سلێمانی-٢٠٠٣، ل٢٤-٢٥-٢٦)

موسڵ بووە مەڵبەندی ویلایەت(نافیع ئەفەندی)ش بووە والیەکەی ئەگبەت خۆی رەعیەت‌وقورپەسەر خەڵکەکەی[1]

لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە بەدواوە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی هەوڵی پەرەوکردنی سیاسەتێکی مەرکەزیدا لەسەرتاسەری ئیمپراتۆرییەتەکەدا[2] ئامانجی سیاسەتەی نوێی عوسمانیش بۆگەڕانەوەی دەسەڵاتی مەرکەزی بوو لەهەرێمە جیاوازەکانی ئیمپراتۆرییەت‌و کوردستاندا، لەپێناو زیاتر پتەوکردنی دەسەڵاتی کارگێڕی عوسمانی‌و دانانی کاربەدەستە تورکەکان لەسەر کوردستان‌و(تحکم) کردن بە رەوشی کارگێڕی‌و ئابوری کوردستانەوە[3].

بەمجۆرە ویلایەتی شارەزوور پاش بەردەوام بوونی لەسێ‌سەد ساڵ زیاتر بەرەو بچوکبوونەوەو گۆڕانکاری رۆیشت، لەویلایەتەوە بۆ(متصرفية)، پاشان بە وویلایەتی موسڵەوە لکێنرا و لە کۆتایدا لەرێکەوتی(١٣٠٩ی رۆمی بەرامبەر٢ی شوباتی ١٨٩٣ی زاینی)، لەسەر داواکاری سەرۆک

---

[1] د.نوری تاڵەبانی: سیاسەتی گۆڕینی واقیعی نەتەوەیی کەرکوک لەکۆنەوە تائەمڕۆ، گۆڤاری کەرکوک، ژمارە(١)ی ساڵی سێیەم، هاوینی-٢٠٠١ ل٤.

[2] سعدی عثمان حسين: كوردستان والامبراطورية العثمانية،(دراسة في تطور السياسي)، رسالة ماجستر، جامعة صلاح الدين، اربيل-١٩٩٥،ص ٦٤.

[3] كامران عبدالصمد احمد دوستكي: كردستان العثمانيه(رساله ماجستر) جامعه صلاح الدين، اربيل ٢٠٠١،ص١٤٧.

وەزیـران(صـدری الاعظـم) (جـەواد پاشـا) بەنوسـراوێکی فـەرمی لەلایـەن سـوڵتان عەبدوولحەمیـدەوە، تیایـدا بڕیـاردرابوو لەسـەر گۆڕینی ناوی(سەنجەقی شارەزوور) بۆ ناوی(سـەنجەقی کـەرکوك) ئەمـەش پێویـست بـوو، چـونکە لێکـچوونێکی گـەورە لـەنێوان ناوەکـانی سـەنجەقی شـارە زوورو نـاوی(سـەنجەقی زور-دێرزوور)دا هەبوو، کە ئێستا دەکەوێتە سوریاوە.[1]

ئەمەش دەقی ئەو بڕیارەیە، کە بۆ ئەومەبەستە دراوە:-

گۆڕینی ناوی سەنجەقی شارەزوور بۆ سەنجەقی کەرکوك:-

شورای دەوڵەت/فەرمانگەی ناوخۆ

ژمارە/٢٨٨٦.

دوای چاوپیاخـشاندنی فەرمانگـەی نـاوخۆ لەیاداشتی(نـضارەی نـاوخۆ) لەبەرواری٢٠ی رەجـەبی (١٣١٠ی کۆچی) نێردراو بۆ شورای دەوڵەت، لەبەر لەیەکچونی نێوان ناوی سـەنجەقی شـارەزوورو سـەنجەقی زور، گواسـتنەوەو گەیانـدنی نامـەو نوسـراوەکانی هەریـەکێکیان بـۆ ئـەوی تریـان بەهەڵـە، مەترسـیو زیـانی لێ دەکەوێتـەوە، لەکاتێکدا مەڵبەنـدی ئەو دوو سـەنجەقانە لـەرابردوودا نـاوی تریـان هـەبووە، ئـەوانیش ناوەکانی(دێر)و(کەرکوك)بووە، دوای رەزامەندی گۆڕینی ناوی یـەکێك لەسـەنجەقەکان کـراوە بـەناوە کۆنەکـەی بـۆ بـەرگرتن لـەروودانی هـەر هەڵەیـەك ئەگـەر گونجـاو بـوو نـاوی سـەنجەقی(الـزور) بگۆڕێـت بـۆ نـاوە کۆنەکـەی کـەوا(الـدین)ە

---

[1] عبدالرقیب یوسف: حدود کردستان جنوبیة تاریخیاً او جغرافیاً،ص١٣٢.

مەڵبەندی کارگێڕییە کەشی شارۆچکەی (الدین) بێت، بیرکردنەوە لە کۆکردنەوەی ئەو ناوچانەی دەکەونە سنوری سروشتی سەنجەقی الزور پاشان ویلایەتێکی لێ دروست بکرێت، گرنگی ناونانی بەناوەکەی خۆی واتە چاوپۆشی کردنی لەگۆڕینی ناوی لیوای ناوبراو، پرس و راگۆڕکێ کرا لە یاداشتی(نضارەی ناوخۆ) دەربارەی ناوی لیوای شارەزوور بەناوە کۆنەکەی کە(کەرکوك)ەوە. ئەگەر رەزامەندی جەنابی سوڵتان وەرگیرا لەسەری، پێویستە فەرمانەکە بەفەرمانگەو مەڵبەندی(مرکز)ی ویلایەتەکان رابگەیەنرێت و لەرۆژنامەکانیشدا بڵاوبکرێتەوە.

(فەرمان ودەسەڵات بۆ فەرمان بەدەستانە)

عاکف. شورای دەوڵەت

مۆر

١٢ی شعبانی ١٣١٠ی ك.

***********

بابی عالی/بەڕێوەبەرایەتی صدارة بۆ سەر بڕیارەکە خۆی

ئامدی دیوانی همایونی

ژمارە/ ٢٢٧٠

گەورەم خاوەن شکۆ:

لەبەر لەیەکچونی ناوی هەردوو سەنجەقی(الزور)و(شەرزور) بۆ نەهێشتنی ئەوکارانەی کە دەبێتە هۆی هەڵە لەکاتی گواستنەوەو گەیاندنی زۆربەی نامەو نوسراوەکان بۆ ئەوەی تریان، لەسەر رەزامەندی جەنابی سوڵتان

بۆناو هێنانی(شارەزوور) بەناوە کۆنەکەی کە(کەرکوک)ە،(مضبطة) وفەرمانگەی ناوخۆو شورای دەوڵەت پێشکەش دەکەین‌و دەیخەینە ڕوو کەتایبەتە بەو ڕاگۆڕکێیەی کراوە لەمەڕ یاداشتی(نضارەی ناوخۆ) بۆ ئەنجامدانی کاری پێویست بۆی وهەرچی لەوبارەوە دەربچێت، دەسەڵات‌و سایە لەلایەن جەنابی خەلیفەوەیە..[1]).

٢٥شعبان١٣١٠ ی‌ك. صدری الأعظم

٢ئاداری١٣٠٩ی ڕۆمی. جواد پاشا.

پاشان لە(٢ی شوباتی١٨٩٣ن) دا سەرۆك وەزیران(صدری الأعظم) جەواد پاشا بەنوسراوێکی ڕەسمی لەسوڵتان(عبدالحمید)ەوە ناوی(متصرفیە)ی شارەزووری گۆڕی بۆ(متصرفیە)ی کەرکوك.[2] بەمجۆرە لیوای کەرکوك لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا بنکەیەکی گرنگی کارگێڕی بووە کە لەهەندێك کاتدا شارە زووریشی گرتووەتەوە. لەهەندێك کاتدا لیوایەکی سەربەخۆ بووە، کاتێ دەسەڵاتی بابانەکانیش لەم هەرێمەدا بنکەی بەڕێوەبردنی شارەزوور بووە، ماوەیەك بەدەست

---

[1] وەرگیراوە لە الموصل‌و كركوك في الوثائق عثمانية. ت.د.خليل علي مراد، سلێمانی-٢٠٠٥، ص٦٨-٦٩. بڕوانە پاشکۆی ژمارە (٣).

[2] د.عمر ابراهيم توفيق: التركمان في العراق(دراسة تاريخيه جغرافيه)،گۆڤاری کەرکوك، ژمارە(٢٤)ی بەهاری-٢٠٠٥، ل١٥٩.

**والی(ئەیالە)وە، یان(متصرفی) سەربە بەغدا یان ویلایەتی موسڵ بووە یان جیابووە لێیان.[1]**

**دوا بە دوای سەرجەم ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە ویلایەتی موسڵدا روویانـدا، لـە سـاڵی (١٣٢٧ك / ١٩٠٩ز) سیستەمی کـارگێڕی ویلایـەتی موسڵو بـەم شێوەیەی لای خـوارەوەی لێهات[2]:**

| | لیوا | قەزا | ناحیە | گوند |
|---|---|---|---|---|
| ویلایەتی موسڵ | لیوای موسڵ | موسڵ | شێخان –عشائر سبعە | ٥٠٦ |
| | | عمادیە | داودیە–بەرواری باڵا– | --- |
| | | زاخۆ | بەرواری ژێر–ریکان– | ١١٠ |
| | | دهۆك | نبروە | ٢١٥ |
| | | عقرە | ----- | ١٣٢ |
| | | سنجار | مزوری | --- |
| | | | زیبار | |
| | | | تلعفر | |

(١) ئەژی: مێژووی سەردەمە کارگێڕیو بەڕێوەبەرییەکانی ناوچەی کەرکوك، ل٤٣.

(٢) عبدالخالید سابیر: ویلایەتی موسڵ لە ساڵنامەی عوسمانیدا، ل ١٢١.

| | لیوای کەرکوك | کەرکوك | ملحە-داقوق-ئاڵتون- | ٣٤٨ |
|---|---|---|---|---|
| | | ڕواندوز | گیل-شوان | ٢٨٣ |
| | | کویسنجق | دیرە حەریرە- باڵەك- | ١٢١ |
| | | ڕانیە | برادۆست-شیروان | ٩٠ |
| | | اربیل | شەقلاوە | ٢٣٠ |
| | | الصلاحیە | --- | ٩١ |
| | | | سلطانیة، دیزەیی | |
| | | | قرەتەپە-طوزخورماتو | |
| | لیوای سلێمانی | سلێمانی | (قرەطاخ) | ١٣٩ |
| | | گلعەنبر | الیجە،سروچك،قزلجە | ٤٧٢ |
| | | معمـــورە | قلعەدیزە،سورکاش،مر | ١٣٧ |
| | | حمید | گە | ١٥٩ و |
| | | بازیان | قلعە سیوکە، سنگاو | ٧ |
| | | شهربازار | سنگ، ماوت | عەشیرە |
| | | | | ت |
| | | | | --- |

ئەوەی جێگای سەرنجە لە سەدەی نۆزدەیەم، تاوەکو نەمانی دەسەلاتی دەوڵەتی عوسمانی لە ناوچەکانی کوردستاندا، کاروباری باشوری کوردستان لە ئەستۆی هەردوو ویلایەتی موسڵو بەغداو ناوچەی جزیرەیش لە ئەستۆی ویلایەتی حەڵەبو ناوچەکانی دیاربەکرو هەکاری لە ئەستۆی ویلایەتی

ئەرزڕۆمدا بوو. گەرچی ئەو ناوچانە بۆ چەند ویلایەتێکی تر دابەش کرابوون ئەو سیستمە بەڕێوەبەرێتییەش کە دەوڵەتی عوسمان لە کوردستاندا لە سالآنی داگیرکاریدا پەیڕەویان دەکرد، تەنها بۆ دەستەبەرکردن و کۆکردنەوەی باجەکان و دابینکردنی بودجەی پێویست بوو بۆ دەوڵەت و کۆکردنەوەی هێزی چەکدار بۆ شەڕەکانیان جگە لەمانە هیچی دیکە نەبوو، هەر بۆیە بە درێژایی ئەو سالآنەیش لاوازییەکی گەورە لەو سیستەمەدا بەدی دەکرا[١].

[١] کەیوان ئازاد ئەنوەر: سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی لە کوردستاندا، گۆڤاری پەیڤین (گۆڤارێکی ڕووناکبیری وەرزییە)، ژمارە (٧)ی دیسەمبەری، ١٩٩٩،ل ٢٢٧.

# باسی دووەم

## (ڕێژەو ژمارەی دانیشتوانی کەرکوک لەسەرچاوە بیانیو تورکییەکانو ڕەوشی کۆمەڵایەتی شار)

گەلی کورد زۆر دەردەسەری بەدەست لێکترازانو پارچە پارچە بوونەوە چەشتووە لەسەردەمو قۆناغە جیاوازەکانی مێژوودا، وا هەڵکەوتووە کورد یەکبگرێو لەسەر خاکو زێدی خۆی دەوڵەتێك یاخود میرنشینێك پێکەوە بنێ. بەڵام زۆری نەبردووە دیسان لەبەر یەك هەڵوەشاوەو کەوتووەتەوە ژێر دەسەڵاتی وڵاتانی دیکە....لەم سۆنگەیەوە، بارودۆخی کوردستان ناجێگیربووەو گەلەکەمان هەردەم لەشۆڕشدا بووە. ئەمانەش زیاتر وای کردووە لێکۆڵینەوە لەکوردستانو

دابەشـكردنی جوگرافیـای دانیـشتوان و سـەر ژمێـری كردنـی خەڵكەكەی كارێكی ئاسان نەبێت.[١]

سەرەتای دەستپێكردنی پرۆسیسی سەرژمێری دانیشتوان لەكوردستاندا بۆ نیوەی یەكەمی سەدەی نۆزدەیەم دەگەڕێتەوە، یەكـەم سـەرژمێری لەسـاڵی(١٨٣١ز) لەلایـەن فەرمانبـەرانی ئیمپراتۆریـەتی عوسمانییـەوە كـرا. ئـەم سـەرژمێرییەش بـۆ دوومەبەسـت بـەجێ گەیـەنرا: یەكـەم لەسـەر داخـوازی وڵاتـانی ئەوروپا، چونكە ئەوكاتە هیچ جۆرە زانیارییەكیان بەشێوەیەكی فـەرمی لەسـەر دانیـشتوانی ئـەم ئیمپراتۆرییەتـە نـەبوو. دووەم عوسمانییەكان خۆشیان پێویستیان بەهەندێ زانیاری هەبوو.[٢]

یەكـەم ئامـاژە كـردن بەدانیـشتوانی كـەركوكیش لەلایـەن گەڕۆكێكی فەرەنسییەوە بووە لەسەدەی نۆزدەیەمدا، سەردانی هەرێمـەكانی ژێـر دەسـەڵاتی دەوڵـەتی عوسمـانی كـردووە بەناوی(كلیمان). هەر لەو گەشتەیدا سەردانی كەركوك دەكات، لەتـەموزی(١٨٥٨ز)دا دوو رۆژ لـەوێ دەمێنێتـەوەو كـاتێكیش ئامـاژە بـەژمارەی دانیـشتوانی كـەركوك دەكـات دەڵێـت:"ئـەو خەڵكانـەی لـەوێ دەژیـن بێجگـە لـەو سـەربازانەی لـەوێن ژمارەیـان(٢٥،٠٠٠)كەسـە، پاشـان كلیمـان ئامـاژە بـەوە دەكـات، لەچواربەش سێبەشـی ئـەو دانیشتوانە كـورد بـوون." ، بـەڵام

[١] جوگرافیـای هـەرێمی كوردسـتان: دانـانی كۆمـەڵێك مامۆسـتای زانكـۆ. ل١٧٧.

[٢] خەبات عەبدوڵا: بنەماتیۆرییەكانی جوگرافیای عەسكەری، ل١٤٧.

کلیمان پاش چەند ساڵێکی کەم سەردانی کەرکوکی کردووەتەوە، ژمارەی دانیشتوانەکەی بە(١٢,٠٠٠-١٣,٠٠٠) کەس خەملاندووە.[1] ئەمەش پێدەچێت لەئەنجامی شەڕو شۆڕوجەنگە یەك لەدوایەکەکانی دەوڵەتی عوسمانی بووبێت لەسەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەداو کاریگەری خراپی کردبێتە سەر رەوشی کۆمەلایەتی ئەم شارە. هەر لەبەرزۆر سەربازگرتنەوە تاوەکو کاریگەری نێگەتیڤی لایەنەکانی دیکەی سیاسی و ئابوری بۆ سەر ئەو ڕەوشە کۆمەلأیەتیە.

بەپێی سەرچاوەیەکی دیکەی بێگانەو بن لایەن نموونەی گەشتەکەی ئەندازیاری ڕووسی(یوسب-یوسف)، کەناسراوەبە(چێرینك)یان(یوسب چیرینك)مان هەیە، ناوبراو لەچوار چێوەی گەشتێکی زانستیدا لەنێو ساڵانی(١٨٧٢-١٨٧٣ز) سەردانی کەرکوکی کردووە، دانیشتوانی کەرکوکی بە(١٢,٠٠٠ - ١٥,٠٠٠) کەس خەملاندووەو لەو خەملاندنەیدا ئاماژەی بەوە کردووە، جگەلە(٤٠)خێزانی ئەرمەنی نەبێت، سەرجەمی دانیشتوانی کەرکوك کوردن.[2] ئەنجامی ئەم گەشتەشی کە بەمەبەستی لێکۆڵینەوە کردن لەسەر ئەگەری دەریاوانی لەهەردوو ڕووباری دیجلەو فوراتو لقەکانیان هاتبووە

---

[1] مجموعة من الاكادمين العراقين: كركوك مدينة القوميات المتاخية، ص١٤٣-١٤٤.

[2] وەرگیراوە لە ئەحمەد عەزیز: کوردستانیەتی کەرکوك لەئینسکلۆپیدیای وڵاتانی ئەوروپاو ئەمریکادا،ل٦٠.

کوردستان، لە (The Jornal Of Royale Russian Geographical, Society Caucasian Department). کۆمەڵەی جوگرافی پاشایەتی ڕووسی، بەشی قەفقاسی، بەرگی شەش)دا بڵاوکراوەتەوە.[1]

ڕۆژهەڵاتناس(بۆرتەر) لەساڵی (١٨٨٢ز) دا سەردانی کەرکوکی کردووە، دەربارەی ژمارەو پێکهاتەی دانیشتوانی کەرکوک دەڵێت:" دانیشتوانی کەرکوک لەکوردو تورکمان و ئەرمەن و ژمارەیەکی کەمیش عەرەب و یەهودی پێکهاتووە، ژمارەی ئەم دانیشتوانەش لە(١٠,٠٠٠-١٢,٠٠٠)کەسە.[2] *

(شەمسەدین سامی) مێژوونوس و گەڕیدەی تورک لەقاموسەکەیدا بەم شێوە باس لەکەرکوک دەکات:" یەکێکە لەشارەکانی کوردستان سەربە ویلایەتی موسڵ....کەرکوک ناوەندی(مەرکەزی)سەنجەقی شارەزوورە، کۆی دانیشتوانی(٣٠,٠٠٠) کەسە، سێ چارەکی($\frac{3}{4}$)ی دانیشتوانی کوردن و ئەوانی دیکەیان تورک و عەرەب و خەڵکانی ترن، لەگەڵ ٧٦٠ جولەکەو ٤٦٠ کلدانی."[3] هەر لەنوسراوەکانی

---

[1] د.نوری تاڵەبانی: سیاسەتی بەعەرەب کردنی کەرکوک، ل١١.

[2] د.بدرخان السندی: المجتمع الكردي في منظور الاستشراقي، اربيل-٢٠٠٢،ص٤٩١.

* بۆرتەر لەو سەردانەیدا بۆکەرکوک ئاماژەی بەژمارەی پێکهاتەی دانیشتوانەکەی نەکردووە.بەپێی دابەش بونی ئیتنیکەکان.

[3] قاموس ئیعلام،ص ٣٨٤٠.

دەوڵـەتی عوسمانیـدا هـاتووە: کـەرکوك لەوویلایـەتی موسـڵی کوردسـتاندایەو (١٦٠کـم) دەکەوێتـە باشـوری ڕۆژهـەڵاتی موسڵەوە، لەدامێنی زنجیرەیەك تەپۆلکەو دۆڵی بەرفراوانی پان و بەرینداییە، مەڵبەنـدی کـارگێڕی سـەنجەقی شـارەزوورەو ناوەکۆنەکەشی(قورکورا)یە. خاوەن قەلایـەکی سەختە، ژمارەی دانیـشتوانەکەی(٣٠,٠٠٠)کەسـە. (٢٨٠٠٠)موسـڵمان، (٤٠٠کلـدانی)،( ١٦٠٠جولەکـە)، موسـڵمانەکانیش لـە کورد وعـەرەب وتورك پێکهـاتوون، زۆرینـەی دانیـشتوانەکەشی کوردن.[١]

سەبارەت بەژمارەی جولەکەش لەشاری کەرکوکدا لەکۆتایی سـەدەی نـۆزدەو سـەرەتای سـەدەی بیـستدا، ئینسایکلۆپیدیای جولەکـە ژمـارەی خێزانـە جولەکـەکان لەشـاری کـەرکوك بە(٢٠٠خێزان) دەخەمڵێنێت.[٢]

لە ساڵنامەکانی دەوڵەتی عوسمانیشدا کە بۆ یەکەمجار لە (٢٩ی شەوالی ١٢٢٨ك/ ١٨٧١ز) کاری پێکرا وە، تا پێش جەنگی یەکـەمی جیهـانی بـەردەوام بـووە، لـەو کاتەشـدا چـەند گۆڕانکارییەکی کەمی تیادا کرا، بەپێی دەرچوونی ٢ یاسا لە (١٨ ڕەبیعی دووەمی ١٣٢٠ك/١٩١٢ز) هەر سەبارەت بە داڕشتنی

---

[١] وەرگیراوە لە کوردستان لەچاپکراوەکانی عوسمانیدا فەیسەڵ دەباغ لەتورکی عوسمانییەوە کردوویە بەکوردی. ل١٣.

[٢] وەرگیراوە لەکرکوك مدینە القومیات المتاخیە: مجموعة من الاکادمین العراقین، ص ٢٥٨.

ساڵنامەکان، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ ساڵنامەی عوسمانی لە ویلایەتی موسڵ. لە ساڵی (١٨٩٠ن) وە تاوەکو ساڵی (١٩١٥ن) دەرچووەو (٥) ژمارەی لێ چاپکراوە لەو ژمارانەدا دەبینین ڕێژەی کورد لە چاو نەتەوەکانی دیکەدا زۆرترە، ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە زۆرینەی دانیشتوانی ئەو قەزاو ناحیەو گوندانەی دەوروپشتی شاری موسڵ کوردن، جگە لە لیوای سلێمانی کە هەمووی کوردە، لیوای کەرکوکیش زۆربەی قەزاو ناحیەکانی ناوچەی کوردنشینن[1].

لە نوسراوێکی دیکەی دەوڵەتی عوسمانیدا هاتووە شاری کەرکوك، لە کوردو تورك و ژمارەیەکی کەم لە عەرەب لەگەڵ (١٠٠٠) کلدانی و ژمارەیەك لەجولەکە پێکهاتووە[2].

لە ساڵی (١٩٠٥ن)دا قەشە (ویگرام) وەکو گەڕیدەیەك لەگەڵ چەند کەسێکی تردا هاتووەتە ناوچەی کەرکوك بۆ گەشتەوەری توێژینەوەی مێژوویی. لە یەکێ لە نووسراوەکانیاندا نووسیویانەو دەڵێن: "کاتێك چووینە شاری کەرکوك بینیمان هەموو دانیشتوانەکەی کورد بوون و هۆزو تیرەکانی دەوروبەریشی هەر کورد بوون، تەنها هەندێك ماڵی سەربازی تورکی عوسمانی بەدی دەکران، سەرەڕای (٤٠) ماڵی دیکە لە

---

[1] عەبدولخالید سابیر: ویلایەتی موسڵ لە ساڵنامەی عوسمانیدا، ل ١٢٢ .١٢٠

(٢) وەرگیراوە لە: ستار مصطفی: کردستانیة کرکوك حسب ارقام و احصائیات غیر، ل ١٨٧.

ئاشوری و ئەرمەنی و کلدانی و جولەکە لەوێ نیشتەجێ بوون.
(٤) رەشماڵی عەرەبی جەواڵەم بەدی کرد. کە (٢) حوشترو (٢) گامێشیان هەبوو، تاوەکو چوونی بۆ بەرواری و هاتینەوە ئەوانیش لەوێ نەمابوون رۆیشتبوون و بۆ ناوچەکانی خۆیان و گەڕابوونەوە[1].

لێرەدا ئەگەر وردبینەوە دەبینین لێکچوونێکی زۆر لەنێو ئامارەکاندا هەیە، هەرچەندە لەڕووی ژمارەی دانیشتوانەکانیانەوە جیاوازی تیادا بەدی دەکرێت، ئەمەش زیاتر بۆئەوە دەگەڕێتەوە، ئامارو سەرژمێری دانیشتوان لەوکاتەدا بەشێوازە وردو مەیدانییەکەی نەبووە، بەڵکو زۆرکات هەرخەملاندن بووە، بەلام لە سەرجەمی ئامارەکاندا خاڵی هاوبەش ئەوەیە، هەتا کۆتایی سەدەی نۆزدە زۆرینەی دانیشتوانی کەرکوك بەڕێژەی $\frac{3}{4}$ کوردن.

بەکۆتایی پێهاتنی میرنشینی بابان و کۆنترۆڵ کردنی راستەو خۆی(بابان العالی) بۆسەر کەرکوك و هەرێمەکانی دیکە بەرێگایەکی ستراتیژی دیار، شێوازێکی نوێی بەعوسمانی کردن لەکەرکوکدا سەری هەڵدا، تەنها لەسەردانەکەی یوسب چێرنیکدا گۆڕانکاری دیار لەپێکهاتەی دانیشتوانی شاری کەرکوکدا رویدا

---

(١) وەرگیراوە لە: عەبدوڵلا دارتاش: مێژووی دەستپێکی هێڵەکانی تەماس لە باشوری کوردستان، گۆڤاری بانەڕۆژ، ژمارە (٢٤) تشرینی دووەمی ٢٠٠٥، ل ٨.

بەشێوەیەك لەبەرژەوەندی تورك و توركمانەكان بوو.[1] دەوڵەتی عوسمانی هانی توركمان وخێزانە توركمانەكانی دەدا بۆ نیشتەجێ بوون لە ناوچەكانی كەركوك، لەڕێگەی دامەزراندنیان لەپۆستە حوكمییەكاندا، یان بەخشینی جیاوگ(امتیازات) پێیان.[2] بەهۆی ئیمپراتۆریەتی بەریتانی و فەرەنسی و رووسیشەوە، بەهۆی شەڕو ململانێكانیان لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا، بەسەدان خێزانی ئاسوری وكلدانی و ئەرمەنی لەتوركیاوە ئاوارەكران و دواتر لەعێراق بەگشتی و كوردستان بەتایبەتی نیشتەجێ كراون و لەوانەش ژمارەیەكی زۆریان كەوتوونەتە كەركوكەوە.[3] دەوڵەتی عوسمانی بەشێوەیەكی بەردەوام لە هەوڵی بەتوركردنی خەڵكدابوو، كردنی كەركوك بە بنكەی سەربازی و بازرگانی و نیشتەجێ كردنی كارمەندێكی زۆری تورك تیایدا، لەبەر ئەوەی ئەوكاتە زمانی توركی زمانی فەرمی دەوڵەتی عوسمانی بوو، زۆرینەی ئەو كوردانەشی كاریان لەگەڵ دەكردن، هەربەزمانی توركی گفتوگۆیان دەكرد. ئەمەبووە هۆی پێكەوەنانی جالییەكی توركی لەم شارەدا، بەڵام ئەمەش

---

[1] د.جبار قادر: التركيب الاثني لسكان كركوك ١٨٥٠-١٩٥٨. گۆڤاری كەركوك ژمارە(٣)ی ساڵی چوارەم، زستانی ٢٠٠٣.ل ١٨٢.

[2] پ.د. ئازاد نەقشبەندی: كاریگەری نەوتی كەركوك لەسەر راگوێزانی كورد. ل٢٧.

[3] وەرگیراوە لە حكومەتی هەرێمی كوردستان: ڕاگەیاندنی پارێزگاری كەركوك، چوار ساڵ كاروخزمەت و بوژانەوەو ئاشكراكردنی سیاسەتی راگواستن و تەعریب.سلێمانی، ٢٠٠٠ ل٧.

ئەوە ناگەیەنێ کە کەرکوك ببێتە شارێکی تورکی وەکو ئەوەی تاوەکو ئێستا هەندێك لەشۆڤێنستەکانی تورك پروپاگەندەی بۆ دەکەن.[1] هەروەکو دەبینین سیاسەتمەداری ئینگلیز(مێجەرسۆن) کاتێك لەساڵی (۱۹۰۷ز)دا سەردانی کەرکوك دەکات و۱٦ڕۆژ لەوێ دەمێنێتەوە، ژمارەی دانیشتوانی کەرکوك بە(۱٥,۰۰۰)کەس لەقەڵەم دەدات، پاشان ئاماژە بەزۆرینەی تورك دەکات لەشاری کەرکوکدا زاڵی زمان و کەلتوری تورکی بەسەر سەرجەم لایەنەکان لەشاری کەرکوکدا، ئەوپێی وایە کەرکوك شارێکی تورکمانییەو عەرەب لەبەشی باشورو ڕۆژئاوای بونیان هەیەو کوردیش لەبەشی ڕۆژهەڵاتی ئەم شارە.[2] بەڵام لێرەدا دەتوانین بڵێین (مێجەر سۆن) بەهەڵەیەکی گەورەدا ڕۆیشتووە. ئەوەتا (د.جمال رەشید) دەربارەی تورك و تورکمان دەڵێت." لێرەدا دەبێت وەك مێژوونێك ڕاستیەك بڵێم، نەك لەبەر ئەوەی کوردم، بەڵکو لەبەر ئەوەی لێکۆڵەرم، بۆیە دەتوانم بڵێم کەرکوك و خوار کەرکوك یان ئەو ناوچانەی پێی دەڵێن گەرمیان، بەشێکی گرنگی وڵاتی کوردستان بووە لەمێژوودا، پەیدا بوونی تورکمان و عەرەب لەگەرمیاندا، وەکو پەیدا بوونی کوردە لەتورکمانستان کاتێك کورد لەسەدەی شازدەهەم بەفەرمانی (شاعەباس)

---

[1] نەتڵەسی کەرکوك: دانانی(لیژنەی باڵای بەرەنگاربوونەوەی بەعەرەب کردن لەکوردستان) چاپی یەکەم، هەولێر ۲۷٥۰کوردی-۲۰۰٥ز، ل٥.

[2] میجرسون: رحلة متنكر الى بلاد مابين النهرين والكردستان، ت، فؤادجميل، جزء الأول، طبعة الأولى، بغداد-۱۹۷۰، ص۱٥٨.

پەیدابوو، بەفەرمانی (تەیموری لەنگ)یش تورکمان لەکوردستانی خوارو پەیدا بوو. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کەوا کوردستانی ئێمە ببێتە تورکمانستان‌و تورکمانستانیش ببێتە کوردستان.[1]

پاشتر یەکێکی دیکە لەو بەڵگانەی بە هەڵەداچوونی (مێجەرسۆن) دەردەخەن راپۆرتێکی وەکیلی قونسوڵی بەریتانیایە لە موسڵ، لە راپۆرتەکەدا کە لە (٥) لاپەڕەی قەبارە گەورە پێکهاتووە لە ڕێکەوتی (٢١ی نیسانی ١٩١٠ن)، جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە ئەو ناوچانەی هەمەوەندەکان لێی نیشتەجێن، دەکەونە باشووری کەرکوکەوەو ژمارەیان بە (٥٠٠٠) کەس لەقەڵەم دەدرێت، هیچ دانیشتوانێك بەقەد ئەوان بوونی لە واقیعی دیموگرافی ناوچەکەدا نییە[2].

بەڵام نکوڵی لەوە ناکرێت کە زمانی تورکی ببووە زمانی ڕۆشنبیری‌و قسەکردن لە ئاستێکی فراواندا، نەك تەنها لەنێو تورکمانەکانی کەرکوك‌و دەوروبەری بەڵکو لەنێوان کوردو عەرەب‌و ئەوانی دیکەشدا. ئەمەش کاریگەرییەکی گەورەی بۆ سەر واقیعە نەتەوەییەکەی کەرکوك هەبوو. هەر لەم بارەیەوە (کریمن) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە لەپێش سالانی جەنگی جیهانیدا جولەکەکانی کەرکوك بە زمانی عەرەبی قسەیان دەکرد،

---

[1] چاوپێکەوتنی گۆڤاری گوڵان لەگەڵ د.جمال رەشید، لەژێر ناوی(گیروگرفتی کەرکوك‌وگەرمیان)، ژمارە(٥٢٦)، سالی یانزەیەم ٣ی ئاداری ٢٠٠٥. ل١٦-١٧.

[2] د. كمال مظهر احمد: كركوك وتوابعها. ص ٦٦.

مەسیحییەکانیش لە کەرکوک کە ژمارەیان بە (٣٥٠) خێزان لەقەڵەم دەدرا بە تورکی قسەیان دەکردو بە سریانیش دەیاننوسی. رۆژنامەو دەرکراوە تورکییەکیانیش رۆڵێکی گەورەیان لەو بوارەدا هەبوو، شتێکی ئاشکراشە کە ژمارەیەك لە رۆژنامەکانی عێراق بە زمانی تورکی یان بە تورکیو عەرەبی یان تورکیو کوردی، رۆژنامەی ئەستەمبوڵ یەکێك بوو لەو رۆژنامانەی کە خوێنەرێکی زۆری هەبوو لەنێو رۆشنبیرە کوردو تورکمانەکانی کەرکوكو هەرێمو ناوچەکانی دیکەدا، بۆ زیاتر جەخت کردنەوە لەسەر ئەوە، یەکێك لە رۆشنبیرە بەناوبانگەکانی تورك (نامیق کەمال ١٨٤٠ – ١٨٨٨ز) کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر شاعیرانی کورد هەبوو. لەوانەش (شێخ رەزای تاڵەبانی) پەیوەندی راستەوخۆیان لەگەڵ یەکتری هەبوو[1].

(ئەدمۆنز) یش کاتێك باس لەژمارەو دانیشتوانی شاری کەرکوك دەکات لەنزیکەی (٢٥,٠٠٠) کەس دەیخەمڵێنێت، ئەو پێی وایە زۆرینەی دانیشتوانی تورکماننو یەك لەچواریشی کوردن، جگەلەوە ژمارەیەکی کەم عەرەبو مەسیحیو جولەکەشی تێدایە.[2]

بەڵام ئێمە لێرەدا ناتوانین هیچ یەکێك لە ئامارەکانی(میجەرسۆن)و(ئەدمۆنز) وەرگرین، چونکە ئەگەر بێتو ژمارەی تورکو تورکمانیش لە کەرکوکدا زیادی کردبێت

---

[1] د. کمال مظهر احمد: کرکوك وتوابعها، ص ٩١-٩٠.

[2] کورد تورك عەرەب، ل٣٢٣.

نەگەیشتووەتە ئەو رادەیەی سێ چارەکی ژمارەی دانیشتوانی پێکبهێنێت. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك سەرچاوە ئاماژە بەوە دەکات، ژمارەیەك لەبنەماڵەو خێزانە کوردەکان لەکەرکوکدا خۆیان بەتورك لەقەڵەم داوە.

ئینسایکلۆپیدیای بەریتانیش یەکێکی دیکەیە لەو سەرچاوە ئینگلیزیانەی هەرچەندە کەرکوکی لە سنوری کوردستاندا دیاری کردووە بەڵام زۆرینەی دانیشتوانەکەی بە تورك لەقەڵەم داوە[1].

بەڵام لێرەدا ئەگەر وردبینەوە دەبینین سەرچاوە ئینگلیزییەکان بەهەڵەدا چوون لەمەڕ ژمارەی دانیشتوان و پێکهاتەی نەتەوەیی شاری کەرکوك کە بەپێی سەرچاوەو بەڵگە مێژووییەکان پێویستیان بە راستکردنەوەی تەواو هەیە.

ڕۆژهەڵاتناسی جۆرجی(ئەلبێرت مینیشا شیفیلی)یش ئاماژە بەوە دەکات، ژمارەیەك لەخێزانە ئەرستۆکراتییەکان لەکەرکوك کوردبوون، بەڵام خۆیان بەتورك لەقەڵەم دەدا، لەوانە خێزانی نەوتچی(النفطچیین)، یەعقوبییەکان، قیردار و هەندێکی تریشیان کەدەچوونەوە سەر عەشیرەتی زەنگەنەی کوردی.[2]

(ئەدمۆنز) خۆشی دان بەو ڕاستییەدا دەنێت، کە بنەماڵە دەوڵەمەندەکانی شار تورك بوون یان ئەگەر کوردیش بوونایە

(1) William Benton & Helen H.B.Benton, Encylopadia Britannica, P 834.

(2) وەرگیراوە لە: د.جبار قادر: التركيب الاثني لسكان كركوك ١٨٥٠-١٩٥٨.ل١٨٤.

خۆیان بەتورك دەناساند. گرنگترین ئەو بنەماڵانەش بنەماڵەی نەوتچی زادە، هەروەك لە ناوەكەیانەوە دەردەكەوێت خاوەنی بیرە كۆنەكانی نەوت بوون و لەو بەرهەمە سروشتییە، قازانجی باشیان دەست دەكەوت، بنەماڵەی (یاقوب زادە) خاوەنی موڵك بوون و دەگوترا كوردی زەنگەنەن، بنەماڵەی قیردار هەم خاوەن موڵك بوون و هەم بازرگان.[1]

سەبارەت بەعەرەبەكان و هاتنیان لەوقۆناغەی دەوڵەتی عوسمانیدا بۆ كەركوك و ناوچەكانی دەوروبەری، لەوكاتەوەی مەدحەت پاشای والی بەغدا ویستی كۆمەڵێك ریفۆرم بكات، یەكێك لەوكارانەی نیشتەجێكردنی عەرەبەكانی عێراق بوو، هەوڵەكانی ئەو لە سالآنی (١٨٦٩-١٨٧٢ز) دەستی پێكردبوو چەندین عەشیرەتی كۆچەری عەرەبی نیشتەجێكرد، لەوانە عەشیرەتەكانی(شەممەرو عنزەو دلێم وكەعب)، لەسەر ئەو زەوییانەی ئێستا لێی دەژین.[2] بەلام لەهەمان كاتدا عەرەب و فارسەكان كاریگەرییەكی مەترسیداریان لەسەر رەچەڵەك و داب ونەریتەكانی تورك هەبوو، ئەم دۆخەش بەشێوەیەكی خێرا لەسەدەی نۆزدەدا كاری خۆی كرد.[1]

---

[1] كورد تورك عەرەب، ل٢٢٣-٢٢٤.

[2] محمد سعید سۆفی: پارێزگای كەركوك لەناو پاكتاوی رەگەزیدا. ل ٨٩-٩٩.

[1] M.Phillips Price: Ahistory Of Turky,( From Empire To Republic), London-1955, P77.

دوای ئەوەی دەوڵەتی عوسمانیش تەپۆلکەکانی حەمرینی کردبووە سنوری ویلایەتی(شارەزوور). هەروەك بە(تخوب)و سنورێکی سروشتی نێوان خێڵو هۆزە کوردو عەرەبەکانی دانابوو. بەڵام لێرەو عەشیرەتە عەرەبە کۆچەرەکان، ئەم سنورو مەزرایانەیان بەزاندووەو پەڕیونەتەوە، لەکاتێکدا لەهەوڵو تەقەلای پەیداکردنی بژێوی‌و گەڕان بوون بەدوای لەوەڕگادا، هەربۆیە چەندین عەشیرەتی جوادی عەرەب وەکو(رەبیعەو،بەنی ئەوس‌وجبور) دەشتەکانی بەلەد روزوش (سەعدیە)و عەشیرەتەکانی(کرێوی‌و لهێب) دەشتەکانی قەرەتەپەیان پڕکرد.[٢]

بەمجۆرە، هەرچەندە ناوچەی کەرکوك دانیشتوانەکەی کورد بووە، بەڵام دانیشتوانی عەرەب‌و تورك زاڵ کراوە بەسەر ئەم شارەداو حکومەتەکانیش رێوشوێنی تایبەتیان گرتۆتە بەر بۆ ئەوباردۆخە لەڕێگەی هاندان‌و پەیرەوکردنی سەرجەم ئەو سیاسەتانەی مەبەستیان بووە، بۆکەم کردنەوەی دانیشتوانی کورد لەم شارە.[١]

---

[٢] محمد سعید سۆفی: پارێزگای کەرکوك لەناو پاکتاوی ڕەگەزیدا...ل ل٩٩-١٠٠.

(1)Martia, Toshea: Trapped Between The Map And Reality, (Geogra phyand perception of Kurdistan), Routledge: Newuork. London, p49.

هەروەکو ئاشکراشە سیستمی کۆمەڵایەتی لەکوردستاندا لەسەر بناغەی هۆزایەتی پێکهاتبوو.[٢] بارودۆخی کۆمەڵایەتیش لەو سەردەمەدا دواکەوتوویی زۆری پێوە دیاربوو، ئەوەش زیاتر هۆکاری ئەوەبوو، دەوڵەتی عوسمانی هیچ بایەخێکی بەبوارەکانی تەندروستیو خوێندنو زانستو پرۆژەی خزمەتگوزاریو بازرگانیو پیشەسازی نەئەدا، بەڵکو تەنها کاری دەوڵەت ئەوەبوو باجوسەرانە لەکۆمەڵانی خەڵکی کۆبکاتەوەو رەوانەی ئەستەمبوڵی بکەن، پاشان بۆ مەرامەکانی سوڵتانی عوسمانی بەکاربهێنرێت[٣]

لەسایەی فەرمانڕەوایەتی سوڵتان عەبدولحەمیدیشدا(١٨٧٦-١٩٠٩ن)، فەسادیو گەندەڵی بەشێوەیەکی زۆر فراوان بڵاوبیوەوە، بەتایبەتیش لەساڵی (١٨٧٨ن)وە تاوەکو کودەتای ساڵی (١٩٠٨ن).[٤]

دەرئەنجامی هەموو ئەوکارەسات و رووداوو گۆڕانکاریانەی لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا روویدا، بووە هۆی دروستبوونی کۆمەڵگایەکی هەمەلایەنی چینایەتی قاودراوی نێوسیاسەتی عوسمانی لەشاری کەرکوک، ئەمەش گەلێك خراپەکاریو گەندەڵی لێکەوتەوە کە ئاکامو ئەنجامی خراپی

---

[٢] عەلی تەتەر توفیق: ژیانا سیاسی لکوردستان،(نامەی ماستەر)، کۆلیجی ئاداب، زانکۆی دهۆك-٢٠٠٢،ل ١٢.

[٣] کەیوان ئازاد ئەنوەر: چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی نوێو هاوچەرخی گەلی کورد، چاپی دووەم، سلێمانی-٢٠٠٠، ل٤٥.

[٤] حنابطاطو: العراق(طبقات الاجتماعية والحركات الثورية من عهد العثماني حتى قيام الجمهورية)،ت. عفيف الرزاز، طبعة ثانيه، لبنان-١٩٩٥، ص٢٥١.

دروستکرد بۆسەر مێژووی ناوچەکەو کۆڵەکەیەکی وای لەو سیاسەتەدا ڕۆنا(بناء)، کەئەنجامەکەی درێژەی سەردەمەکانی لەوەو دواوە بێت و زۆر بەزەحمەت بتوانێت لێی ڕزگار ببێت. ئەویش لەتەرازوی بەراوردەکاندا ڕەنگی دایەوەو کۆڵەکەکەی لەبارێکی زۆر چەوت و چەواشە کردوودا کاریگەری زمانەوانی و ئابوری و کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیری بەجێهێشت. تاوەکو ئەم سەردەمەی ئێستاشمان هەر پاشماوەی ماوە، گەورەترین کارتێکردنیش جێ پەنجەی بەجێهێشت، چالاکی و کنە کردنی بزوتنەوەی تورانچێتی بوو، زۆر ئەنجام و کاریگەری خراپی لێ کەوتەوەو هێڵەکانی بەڕوونی دەرکەوت کەڕۆژ لەدوای ڕۆژ ئامانجەکانی خۆی لەنێو نەتەوەکانی شارەکە پێکاو بۆشایی گەورەی خستە دوروتوێی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانەوەو بووە ئاستەنگێکی گەورە لەچوار چێوەی ئەو پەیوەندییانەدا.[1]

[1] د.جمال رشيد: كركوك في عصور القديمة، ل ل ٥٠-٥١.

# باسی سىٚیەم

## سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی لەکەرکوکداو بارودۆخی سیاسی ئەم شارە

سیاسەتی نوێی عوسمانی لەسەر بنەمای کۆنترۆڵکردنی ڕاستەوخۆی سەرجەم هەرێمەکانی بنیات نرابوو، کۆتایی هێنان بەدەسەڵاتی میرنشینی بابان، دەرئەنجامی یەکێک لە کۆنترۆڵە ڕاستەوخۆکانی دەوڵەتی عوسمانی بوو لە کەرکوك و ناوچەکانی دیکەدا.[1] عوسمانییەکان هەموو هەوڵێکیان ئەوە بوو، کەبتوانن بکەونە دروستکردن و ئامادەکردنی هێز لەوهێڵەدا. ئینجا لەبارێکی سەربازی یان کۆمەڵایەتییەوە بەئەنجامی بگەیەنن. هەربۆیە زیاتر پێداگرتنەکەیان لەناوچەی(کەرکوك) بووە، لە شوێن و ناوچەکانی تر زیاتر لە چنینی ئەو سیاسەتەدا حسابیان

[1] د.جبار قادر: التركيب الاثني لسكان كركوك ١٨٥٠-١٩٥٩، ل ١٨١.

بۆ کردووە، تا بەرەی لەهەموو لایەنەکانی رۆشنبیریو ئابووریو کۆمەڵایەتیو تەنانەت لەتەرزی بیناکاریش توانیویانە ئەوەی پێویست بێت هەوڵیان بۆی داوەو ئەو بیناکارییەشیان لەچوار چێوەی پێویستی سەربازی نەچووەتە دەرەوە.[١] عوسمانییەکان لەدژی کوردان سیاسەتی(پەرت کەو زاڵ بە) یان بەکار دەهێنا بەو پێیەش نەیاندەویست دۆستایەتیو یەکێتی لەنێوان عەشیرەتە کوردە کاندا هەبێت، چونکە ئەمە دەبووە مایەی هەرەشە بۆسەر دەوڵەت، بۆیە زۆرجار ناکۆکیان لەنێوانیاندا دروست دەکرد.[٢] سیاسەتی تورکە عوسمانییەکان بەئاراستەی عەشایەرەکان کە لەسەر بنەمای بلاوە پێکردن بوو، هانی ناکۆکیو دووبەرەکیان لەنێوان گەورەی عەشیرەتەکانو شێخەکاندا دەدا، شێخە عەشایەرەکانیش هێندێك جار هەوڵی هاوپەیمانیان دەدا لەدژی یەکتری، دواکەوتوویی شێخو گەورەکانیش بەگشتیو مامەڵەی راستەوخۆیان لەگەڵ باڵە عەشایەرییەکاندا کارئاسانی بۆ ئەو دۆخە دەکرد، بۆ بەئەنجام گەیاندنی ئەم سیاسەتەش تورکەکان

---

[١] د.کاوس قەفتان: یاسای باجگریو دۆخی ئابوری ناوچە کوردیکانی دەوڵەتی عوسمانی لەسەدەی نۆزدەهەمدا، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ (گۆڤارێکی گشتی مانگانەیە لەلایەن دەزگای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردییەوە دەرکراوە)، ژمارە(١٤٠)، ١٩٩٧، ل٥٧.

[٢] د.عەبدوڵا ئالیاوەیی: کوردستان لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا، لە ناوەراستی سەدەی نۆزدەوە تاوەکو جەنگی جیهانی یەکەم)، لێکۆڵینەوەیەکە لە بواری مێژووی سیاسیدا، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی، کوردستان. چاپی یەکەم، سلێمانی-٢٠٠٤، ل١٠٢.

چەکی کاریگەریان بۆئەم بوارە دابین کردبوو، ئەویش چەکی زەوی بوو.[1]

لە ساڵی (١٨٦٧ز)دا هەمەوەندەکان لەگەڵ (نامیق پاشا)ی والی بەغدا تێکچوون و پاش شەڕو هەرایەکی زۆر هەمەوەندەکان بەرەو زەهاو ڕۆیشتن، بەڵام کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی لەدوای ڕێکەوتنێك لەگەڵیاندا هەمەوەندەکان گەڕانەوە بازیان، لەسەردەمی مەدحەت پادشای والی بەغدادا دوژمنایەتی جارێکی دیکە سەریهەڵدایەوە، بۆ ئەم مەبەستەش والی دەستەیەکی سەربازی لەگەڵ (٥٠٠) سوارەی چەرکەسیدا ناردە سەریان بەڵام ئەم لەشکرە تێکشکاو لە ئەنجامی ئەوەدا (رەئوف پاشا)، کە لە پاش مەدحەت پاشا بووە والی بەغدا لەگەڵ هەمەوەندەکان ڕێککەوتەوەو هەمەوەندیش بۆ جارێکی دیکە گەڕانەوە بازیان[2].

لەساڵی (١٨٨٠ز)دا هەمەوەندەکان هەستان بەکۆنترۆڵ کردنی ڕێگاکانی بەشی ڕۆژهەڵاتی کەرکوك.[3] دەوڵەتی عوسمانیش شاڵاوی بردە سەر خێڵی هەمەوەندو ژمارەیەکی زۆری لێ ئاوارەکردن.[4]

یەکێك لەو سیاسەتانەی دەوڵەتی عوسمانی دژ بەگەلی کوردی ئەنجامی داوە پرۆسیسی ڕاگواستن بووە، ئەم پرۆژەکەیەش

---

[1] حنا بطاطو: العراق، ص١٠٠.

[2] وەرگیراوە لە: سەرتیپ هەمەوەندی: دورخستنەوەی هەمەوەند بۆ تەرابلوسی ڕۆژئاوا لە ئەفریقا، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە (٢) ی ساڵی حەوتەم، زستانی ٢٠٠٦،ل١٤٢.

[3] لیلی نامق جاف: کرکوك لمحیات تاریخیە،ص٤٠.

[4] کورد کوردستان: ن. کۆمەڵێك لەپسپۆڕان و ئەفسەرانی ئینگلیز، ل٣٩.

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا هاتە کایەوەو عەشیرەتی هەمەوەند بۆ ئەو کارە دەستنیشانکرا، لەسەرەتاوە ئەو بیرۆکە وەهابوو، ژمارەیەك لەم عەشیرەتە بەرەو کەناری رۆژئاوای تورکیا رابگوێزرێن، دواتر ئەوە بەباشتر زانرا بەرەو لیبیا رابگوێزرێن، پرۆسیسی راگواستنی هەمەوەندییەکان بۆ ولاتی لیبیا لەسەردەمی(ئەحمەد راسم پاشا)ی والی تەرابلوس بوو. کە حکومەتی ئەستەمبوڵ ئامادەباشی خۆی دەربڕی بۆ جێنشینکردنی(١٠٠-٢٠٠)خێزانی کوردی لەلیبیا، بەمەرجێ دەوڵەتی عوسمانی پێداویستی خۆراكو تایبەت بەکاری کشتوکاڵی و تۆو دابین بکەن. بەتایبەتی لەساڵی یەکەمی نیشتەجێکردنیان بۆ ئەوەی سەرقاڵی کاری کشتوکاڵی بن لەشوێنە تازەکەیاندا، هاندەرێکیش بێت بۆ جێنشینبوونیان لەو شوێنەدا، دواتر حکومەتی عوسمانی رەزامەندی خۆی دەربڕی بۆ پێشنیارەکەی (ئەحمەد راسم پاشا).[1]

تورکە عوسمانییەکان لەساڵی(١٨٨٦ز)دا، داوایان لەسەرۆك تیرەکانی هەمەوەندو پیاو ماقوڵانیان کرد کۆبوونەوەیەك لەکەرکوك هەیە (ئیسماعیل پاشا) دەیەوێ چاوی پێیان بکەوێ. بۆ ئەم مەبەستەش رۆژێکیان بۆ دیاریکردن، پاشتر ژمارەیەکیان ئەڕۆن بۆ کەرکوكو رۆژێکیان لێ دەگاتە کەرکوك، پاش ئەوەی گەیشتنە ئەوێ بردنیان بۆ قشڵەی سەربازی، تاکو ئێستا ئەم

---

[1] جرجيس فتح الله: يقظة الكرد،(تاريخ السياسى١٩٠٠-١٩٢٥)، طبعة. الأولى. اربيل-٢٠٠٢، ص ٦١-٦٢.

سەرایە ماوەو لەوبەر خاسەوەیە. لەوێ چەکەکانیان لێسەندن و دەرگایان لەسەر داخستن، دەوڵەتی عوسمانیش بۆ رۆژێکی وەکو ئەو رۆژە دەگەڕاو پاشان سەربازێکی زۆری دیکەی بەناوچەکاندا بڵاوکردەوە. بۆ گرتنی هەمەوەندو هەر کەسێکیان بگرتایە باڵبەستیان دەکردو دەیان نارد بۆ کەرکوک. پاش کۆکردنەوەیان وەکو دیلی جەنگ دەوڵەتی عوسمانی دەستیکرد بەگواستنەوەیان بەرەو موسڵ، لەوێشەوە بۆ ماردین و قۆنیەو سیواس و ئەدەنە، ئینجا باکوری ئەفریقا، بەشێکیشیان بۆ دورگەکانی ناو دەریای سپی ناوەڕاست،[1] ئەو هەمەوەندانەی بەرەو تەرابلوس راگوێزران لەنێویاندا چەند سەرکردەی کوردی تیادابوو کە دەوڵەتی عوسمانی بەمەترسی گەورەی لەقەڵەم دەدان. هەندێ لەوانە پێشتر لەناوچەی ئیزمیری سەر رۆخی ئەنادۆڵی رۆژئاوا بوون، کۆمەڵێکی تریشیان رەوانەی(بەنغازی) کران، بۆئەوەی لە(چیای سەوز) نیشتەجێ بن. بەڵام ئەو کۆمەڵە خێزانەی نێردران بۆ تەرابلوس، ئەو کارەی حکومەتی ویلایەتەکە بۆیانی رێکخستبوو لەئەنجامدانی کاری کشتوکاڵی و نیشتەجێ بوون لەناوچەی(سیرت)دا، ئەوان هەستان بەرەت کردنەوەی. پاش سەرنەکەوتنی کارەکە، لەرێگەی پرۆژە کشتوکاڵیەکەوە،(ئەحمەد راسم پاشا ) هەوڵیدا رێگایەکی دیکە بدۆزێتەوە بەدانانی گەنجە ئاوارە کراوەکان لەنێو هێزە

---

[1] نوری حەیدەر هەمەوەندی: مێژووی شاراوەی هەمەوەند، چاپی یەکەم، سلێمانی-٢٠٠٢، ل ل١٣٨-١٣٩.

نیزامییەکانداو هەندێکی تریان بۆ نێو هێزە دەریاییەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەکەنارەکانی لیبیا. بەڵام ئەوان ئەم کارەشیان رەت کردەوەو داوای گەڕانەوەیان کرد بۆ زێدی باوباپیری خۆیان. پاشتر والی لیبیا نامەیەکی بۆ دەوڵەت ناردەوەو تیایدا ئاماژەی بەسەرنەکەوتنی هەوڵەکانی خۆی کردبوو بۆ نیشتەجێکردنی ئاوارەکان.[1] لەساڵی (١٨٩٩ز) بەدواوە کوردەکانی خێڵی هەمەوەند دەستیان کرد بەهەڵهاتن بەرەو کوردستان، خەڵکی لیبیاش لەبەرئەوەی رقێکی زۆریان لەتورك و دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی بوو، رێگاکانیان نیشانی کوردە هەمەوەندەکان ئەدا کەچۆن برۆن و لەکوێوە برۆن.[2]

دورخستنەوەی هەمەوەندەکان بۆ دورگەکانی ئەفریقا لەوێوە دەستپێکرد، کە خەڵکی شاری موسڵ رۆژی (١٩/ شەوالی ١٣٠٤ی کۆچی - ٢٧/حوزەیرانی ١٨٨٦ز) مەزبەتەیەکیان ئاراستەی (صدری الاعظم) کرد، تیایدا داوای دورخستنەوەی هەمەوەندەکانیان بۆ تەرابلوس لەلیبیای ئێستا کرد. ئەم مەزبەتەیەش ئیمام و موختاری زیاتر لە (٣٠) گەڕەك ئیمزایان کردو مۆری (٩٩)کەس بە مەزبەتەکەوەیەو ئەمەش ناوی ژمارەیەك لەو گەڕەکانەی شاری موسڵە (جامع جمشید، باب النبی، میدان، حوش الخان، باب السرای، سنوسە، جاموسیە، جامع الکبیر، امام ابراهیم، رأس الکور، سراج الخانە، مکاوی،

---

[1] جرجیس فتح الله: یقظه الکرد، ص٦١.

[2] نوری حەیدەر هەمەوەندی: مێژووی شاراوەی هەمەوەند، ل١٤٤-١٤٥.

باب المسجد، حمام، جامع الرابعه، جولاق، عمو شيمال، سوق الصغير، مياسا، محمود بن دراج، منصوريه، جيهار سوق، امام عمونەدين، باب الجديد، باب البيض، مشاهيده، شيخ فتحى، جامع، شيخ ابو علی) پاش پەسەندکردنی ئەم مەزبەتەيە بەشێکی زۆری خێڵی هەمەوەند، بە ژن و منداڵیانەوە بۆ تەرابلوسی رۆژئاوا دوور خرانەوە[1]. پاشتر بە هاندانی (موشیر ئیسماعیل حەقی) کوڕی (محەمەد شەریفی کوردی بەدلیس)، کە دەوڵەتی عوسمانی بە ناوی (مأمور اصلاح)ەوە ناردبوویە کەرکوک بۆ سەرکوتکردنی جوڵانەوەکانی هەمەوەند. لێرەدا چەند بەڵگەنامەیەکی دەوڵەتی عوسمانی دەخەینەڕوو، کە زیاتر ئەو ڕووداوو گۆڕانکاریانەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە.

بەڵگەنامەی یەکەم/

١٤٥٦:

ئەو هەمەوەندانەی دوور خرانەوە بۆ ویلاتە زانراوەکانی شاهانە تا ئێستا (٣٢) لە سیواس و (٩) لە قۆنیا کە سەرجەمیان (٤١) کەس دەکات، هەڵهاتوون بۆلای موسڵ و کەرکوک و شەڕیان کردووە وەڵامی وەرگیراوی والیەکان (٢) پارچە تەلگرافە، ئەوانەی کە ماونەتەوە بۆ ئەوەی لە سایەی شاهانە ڕێگایان نەدرێت لاساری و ناپاکی بکەن، ڕێو شوێنی پێویست بۆ بەڕێوەبردنی ناوچەکە دانراوە. ئەمجارە وەڵام لە

[1] وەرگیراوە لە: سەرتیپ هەمەوەندی: دوورخستنەوەی هەمەوەند بۆ تەرابلوسی رۆژئاوا لە ئەفریقا، ل ١٤٤.

ویلایەتی موسڵ و قوماندانی کەرکوك و موتەسەریفی سلێمانی وەربگیرێت و هەریەك وێنەی ئەو جێگایەی لێی دەرچوون دەنێردرێت بۆ جەنابی شەهریاری. ئەم وەڵامانە لە (٢) بروسکەدا هەن. لە سایەی جەنابی شاهەنشاوە تا ئێستا (٨) کەس لە هەڵهاتووانی هەمەوەندو (٤) کەسی غەوارە، کە دەبنە (١٢) کەس کەوتونەتە دەست و بروسکە لەبارەی خراپی رەفتاریانەوە بەدەست گەیشتووە. ئەو رێنمانیانەی بەندەتان دراونەتە هەریەکە لە عەسکەری شاهانەتان و سوارەکانی عەشایەرو ئەو مەفرەزانەی لەمانە دروست کراون نێردراون و تاقیبکردنیش بەهۆی ئەمەوە بە گەرمی هەر بەردەوامە. سەرکەوتنی ئێمە لە هەر بارێکدا لە سایەی جەنابی خەلیفە هەر دیار دەبێ، ئەگەر کەمە درێفی کردنێکیش هەبێ ئەوا بەم زوانە سەرکەوتن بەدەست دەهێنرێت، زۆر هیوامان بە لوتفی خوایە. ئەو شتەی کە ئێوە چاوەروانی ئاگادار کردنن لە بارەیەوە ئەگەر ئەمرۆ من عەرزیشی بکەم هەموو فەرمان و لوتف و چاکەی حەزرەتی (ولی امر)ە.

(١)ی رەجەبی ساڵی ١٣٠٥ ك / (١)ی مارتی ١٣٠٢رۆمی

بەندەتان

ئیسماعیل محەمەد شەریف

بەڵگەنامەی دووەم/

بروسکەی ( مەئموری ئیسلاحات ئیسماعیل حەقی ) بۆ جەنابی ( صدري الاعظم )

رۆژی نووسینی ( ١٤/ تەموزی ١٣٠٢ ی رۆمی/ ١٨٨٦ز) بە ژمارە ( ٤٤٧/ی رۆژی ١٥/ تەموز ) لە کەرکوکەوە نێردراوە، داوای تێدا کراوە هەمەوەندەکان دوور بخرێنەوە بۆ وڵاتی ئەنادۆڵ. بروسکەکە گوتویەتی: هەمەوەندەکان بە رەزامەندی سوڵتان عەبدولحەمید دوور خرانەوە بۆ ماردین و موسڵ و هەکاری، بەڵام پاش ئەوەی کاری خراپیان لێ وەشایەوە، کە پێدەچێ زەوتکردن و کاری تاڵانکاری بێ لەو ناوچانەی کە هەڵهاتن بۆیە ( ئیسماعیل پاشا ) پێشنیاری کردووە کە دوور بخرێنەوە بۆ ئەنادۆڵ، دوورخستنەوەشیان بۆ ئەو ناوچە ناوبراوانە کەم و زۆر پێش رۆژی ( ٢ی حوزەیران )ی هەمان ساڵ بووە، کە ئەمەی لای خوارەوە دەقەکەیەتی:

( ١٤٤ ) خێزانی هەمەوەندم بۆ موسڵ و ( ٢٣ )خێزانم بۆ ماردین و ( ٤٦ )خێزانم بۆ هەکاری بە رەزامەندی ئیرادەی سوڵتان دوور خستەوە وەك لە بروسکەی ( ٢/ حوزەیران/١٣٠٢ )دا هاتووە دوای ئەوەی برانە ئەم ناوچانە، مامەڵەی خراپیان لەگەڵ دانیشتوانیاندا کرد. لەبەر ئەوە ناگەڕێنەوە بۆ ئەم ناوچانەتکایە با بگوازرێنەوە بۆ ناوچەی دوور لە ئەنادۆڵ و رەزامەندی سوڵتان لەسەر ئەم کارە پێویستە.

( ١٤/تەموز/١٣٠٢ )

یاوەری ئەکرەم مەئموری ئیسلاحات

ئیسماعیل حەقی

به‌ڵگه‌نامه‌ی سێیه‌م/

به‌ڵگه‌نامه‌یه‌ك به‌ئیمزای ( طاهر ) موته‌سه‌ریفی سلێمانی سه‌بارەت به‌ تاقیبکردنی هه‌مه‌وه‌ندەكان، له‌لایه‌ن هێزەكانی عوسمانیو ( شێخ موسته‌فای نه‌قیب ) نه‌قیبی ساداتی سلێمانی كوڕی سه‌ید محه‌مه‌دی شێخ. ئه‌ویش له‌ ڕۆژی (٢٩/شوبات/١٣٠٢- ٢٩/شوبات/١٨٨٦ز). هێزەكانی تاقیبكردن بریتی بوون له‌ (٨٠ )كه‌س له‌ ساداتو به‌سه‌ركردایه‌تی ( شێخ مسته‌فا )و (٨٠ زەبتیه‌ ). ئه‌م به‌ڵگه‌نامه‌یه‌ له‌ دانانی ئه‌سڵییه‌وه‌ ڕەنووس كراوه‌ له‌لایه‌ن مه‌ئموری ئیسلاحات ( موشیر ئیسماعیل حه‌قی پاشا )كوڕی ( محه‌مه‌د شه‌ریف ) كه‌ ئه‌مه‌ش دەقه‌كه‌یه‌تی:

( حه‌مه‌ جان ی حوکمدار، که‌ هاوكاری هه‌مه‌وه‌ندەكانی دەكرد هاته‌ پاڵ حكومه‌تو هه‌مه‌وه‌ندەكان به‌هۆی سوڵتانه‌وه‌ ناتوانن هێزەكانیان زیاد بكه‌ن، بۆ پاراستنی ژیانی خۆیانو به‌رخودانیان كه‌م بووەته‌وه‌. ئه‌مڕۆكه‌ ( نه‌قیب سه‌ید موسته‌فا ئه‌فه‌ندی ) له‌گه‌ڵ ( ٨٠ ) كه‌سی ساداتو هه‌مان ژمارەی زەبتیه‌دا، چوونه‌ دەرێ بۆ تاقیبكردن، پشت به‌خوا سه‌ركه‌وتنی تازە به‌دەست دێتو ئه‌نجامه‌ چاكه‌كانیش به‌م نزیكانه‌ به‌رچاو دەخرێن[1].

موته‌سه‌ریفی سلێمانی

طاهر

هاوجووتی ئه‌سڵه‌كه‌یه‌ له‌ ( ١ی مارتی ١٣٠٤) دا

قوڵكه‌ری ( ٢ ) / ئیسماعیل حه‌قی

---

[1] ئه‌م به‌ڵگه‌نامانه‌ وەرگیراوە: ﻟﻪ عه‌بدولڕەقیب یوسف: چه‌ند به‌ڵگه‌نامه‌یه‌ك له‌ بارەی هه‌مه‌وه‌نده‌وه‌. گۆڤاری هه‌زار مێرد. ژماره‌ ١٠ی ساڵی سێیه‌م. كانونی یه‌كه‌می ١٩٩٩، ل ٩٢ ٩٦، (بڕوانه‌ پاشكۆی ژماره‌ ٤-٥-٦).

**بەڵگەنامەی چوارەم/**

لە سایەی حەزرەتی پاشاوە، کاروباری سوڵح و ئاشتی سەری گرت و وردەکارییەکانی لەلایەن منی کەم تواناوە عەرزی جەنابی گەورەی نەزارەت کرا، کە خێڵەکانی هەمەوەندو شوان و شێخ بزێنی بڕیار لەسەر پێکهاتنیان دراو ئەو شتانەی کە تالآن کراون و لەدەستیاندایە دەبێ بیدەنەوە. خێڵەکان راسپێردران دەبێت پشتیوانی ئاسایش و ئارامی هێمنی گشتی بکەن و تەواو کردنیان لەلای منە. بە پێی ئەو راسپێری و ئاگادارییانە کە بە من گەیشتوون لەلای (سلێمانی سەرۆکی جاف) خاوەن سەعادەت (مەحمود) و (عوسمان پاشا) ی قایمقام فەزیلەتی (موستەفا ئەفەندی) ئەفتیی سلێمانی و لەلای کەرکوک خاوەن فەزیلەت (حەسەن ئەفەندی) موفتی شارو (ئەحمەد بەگ) لە ئەندامانی ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی لیواو (حەسەن ئاغای بێن باشی) تابوری جەندرمەی کەرکوک، ڕوومان کردە چەمچەماڵی ناوەندی قەزای بازیان و ماوەیەك لەوێ ماینەوە، ڕێو شوێنی بنچینەیی سوڵح و پێکهاتن و بە پێی ڕێنوماییو راسپاردەکان دانراو ئاسایش و ئارامی نێوان هەردوولا بەجێ هات. دەستپێشخەری کرا، تا دووبەرەکی نەهێڵرێ و هیچ ڕوو نەدات. کردەوەی حکومەت و خزمەتی چاك لەگەڵ سەرۆکانی خێڵەکان و پیاوماقوڵاندا لەو دەورووبەرانەدا بەرچاو بوون. نمونەی ئەمانە لە دەرکەوتنی سۆزی نێوەدا دەبنە هاندان هەروەها حکومەتیش سودی باشی بۆ پەیدا دەبێ. ئاسایش و ئارامی ماوەیەکی زۆری لەمەوبەر بە هۆی ئەو ناوبراوانەوە لە چەمچەماڵ پەیدا بووە .قوماندانی سەربازی بنباشی (حاجی ئەفەندی) زەبت و خزمەتی چاکی دابین کردون، ئەمە خەڵکیش پەسەندی کردووەو مەدالیای شانازی دڵخۆشی بدرێتێ و لەلایەن بەرزی

ئاسەفانەوە پشتگیری لێ بکرێت. هەروەها مەدالیای زێڕ ببەخشرێت بە ( رەمزی ئەفەندی ) کاتبی ویلایەت تا ببێتە شایەنی بەرزی داد پەروەری بێ کەموکوری، ئەمەش فەرمانی حەزرەتی خاوەن فەرمانە.

٢٩ی ( جمادی الاولی )ی ١٣١٦/ ٣ی تشرینی یەکەمی ١٣١٤
والی موسڵ مونیر بەندە
السید محمد عارف

بەڵگەنامەی پێنجەم/

بەڵگەنامەیەك سەبارەت بە هەڵهاتنی ئەو هەمەوەندانەی دوور خرابوونەوە بۆ سیواس و قۆنییەو پاشان بەو شەڕو شۆڕەی لەنێوان هەمەوەندو سوپای عوسمانیدا لە ( داقوق ) روویدا، ناوی کوژراوو دەستگیرکراوەکانی تێدایە، مێژووی بەڵگەنامەکە ( ٢٨ی شوباتی ١٣٠٢ی رۆمی/ ٢٨ی شوباتی ١٨٨٦ز ) ژمارەی بەڵگەنامەکەیش ( ١٤٥٦ )ە کە ئەمە دەقەکەیەتی:

( ئەحمەد ئاغا و مەحمود جینە ) لە رێگرانی هەمەوەند پێشەکی کوژران و ( ٥ ) کەس دەستگیر کران، کە ئەوانیش بریتین لە ( میرزا لای ) لە پیاوەکانی ( حەسەن بەگی جاف ) ئەوانی دیکە ( کاکە وەیس و حامید رەشید عەبدولرەحمانی بازیانی و ئەبو سەباحیلی محەمەد و هاورێ سالح )، ئەمڕۆ تەسلیمی بەندیخانەی کەرکوك کراون و ئەوی دیکەیش ( کەریم قادر )ە کە لە شەڕەکەی دوو رۆژ لەمەوبەردا بە برینداری کەوتە دەست مەفرەزەکەی ( علی حذار )ی قایمقام و تەسلیمی دەسەلاتدارانی

حکومەت کرا لە چەمچەماڵ. ئەو شەڕەی لە نزیکی داقوق ڕوویدا ( علی عبدالرزاق ) لە تیرەی بەشاوەندو ( علی کوڕی قادر ئەحمەد عەبانی ) لە تیرەی ڕەمەوەند تێدا کوژران و ( ئەحمەد بازە )ی تێدا گیراو پاشتر سێ تــەرەی هەمەوەنــد دۆزرانــەوەو بــەڵام نــەزانرا ناویــان چییە، بریندارەکانیش نەکەوتنە دەستو ناونیشانیان نەزانرا، لەسەرویەندی شەڕێکی دیکەیشدا یەکێك لە ڕووباری ( کۆپری ) خنکاو هەرچی ژ یان و بریندارەکانی دیکەشە لەلایەن ئیستخباراتەوە نەزانراوەو جەنەراڵی سەرکردایەتی ئەمەی بەرچاو خستووە.

٨ی شوباتی ساڵی ١٣٠٢

فەریق عەلی

هاوجوتی ئەسلەکەیە لە ( ١ی مارتی ١٣١٤ )

بەندە ئیسماعیل حەقی

**بەڵگەنامەی شەشەم/**

ئەم بەڵگەنامەیە لە ڕێکەوتی (١٩٠١/١١/١١ی.ز)دا دەرچووە لە دائیرەی کاتبی یەکەم (باشکاتب - سرکاتب)ی سەر یەڵدزی شاهانە (یلدز سرای – همایون) و بە ئیمزای تەحسینی باش کاتبی سوڵتانەی (سوڵتان عەبدولحەمید) بە مێژووی (١٣ی شەعبانی ١٢٩١ك/١٣ تشرینی دووەم/ ١٣١٧ڕۆمی)، ژمارە (٥٩٤٧) کە ئەمەی لای خوارەوە دەقەکەیەتی:

لە ویلایەتی موسڵەوە هاتوون و هەمەوەندەکان داوای مافی پەنابەری لێبوردنیان کردووەو دەخالەتیان بۆ کراوەو داوایان کردووە ئەو بڕە ڕۆژانەیان بدرێتێ کە لە ئەدەنە دەدرایە دەیان وەکیلی والی موسڵ، ئەمەی عەرز کردووەو داوای ڕەزامەندی جەنابی شاهانەی کردووە[1].

١٣ی شەعبانی ١٣١٩ – ١١ی تشرینی دووەمی ١٣١٧
سرکاتبی حەزرەتی شەهریاری
بەندە تەحسین

[1] وەرگیراوە لە: عەبدولرەقیب یوسف: چەند بەڵگەنامەیەك لە بارەی هەمەوەندەوە، ل ٩٦-٩٧-٩٨. بڕوانە پاشکۆی ژمارە ٧-٨-٩.

لەیـــەکێ لەراپۆرتەکانـــدا لەرێکـــەوتی(٨/٨/١٨٩٨ن) دا، لەلایـەن(رضـا)ی سـەکردەی سـوپاییەوە نێـردراوە بـۆ سـوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم، لەم راپۆرتەدا سەرکردەی سوپایی ئاماژە بـــەوە دەکـــات، کـــە عەشـــیرەتی هەمەوەنـــد هـــەمووکات بەسەرپێـــچیکردن لەفەرمانـــەکانی دەوڵـــەت بـــەناوبانگ بـــوون، بوونەتە هۆی ناسەقامگیری ناوچەکانی کەرکوك، ئەم عەشیرەتە هەستاوە بەهێرش کردن بۆسەر عەشیرەتی شوان هاوکاریکەری دەوڵـــەت هـــەر لەهـــەمان راپۆرتـــدا دەرکـــەوتووە، لێپرســـراوو کاربەدەســـتان لـــە ویلایـــەتی موســـڵ نـــاڕازین لەهەڵـــسوکەت و جووڵانـەوەکانی ئـەم عەشـیرەتە، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش داواکـرا لەسەرکردەی سوپای شەش کە هەستێت بەلێدانی دەسەڵاتیان، پێشنیازی ئەوەش کرابوو کە سەرجەم عەشیرەتەکانی دەڤەری زرێبـار بەشـداری تیـادا بکـەن، لەگـەڵ(٤٠٠-٥٠٠) سـەرباز لـە سـوپای بەغـدا بەسـەرکردایەتی(بـەکر بـەگ-آمرمدفعیـە)،پێشتر بەشـــداری لێـــدانی هەمەوەنـــدەکانی کردبـــوو. شـــارەزاییەکی باشیشی لـە جوگرافیـای ناوچـەکەدا هـەبوو، هـەر لەراپۆرتەکـەدا داواکرابوو بۆ گرتنەبەری رێوشوێنێکی توند لەسەر رێگای کفری بۆ رێگرتن لەهـەر جۆرە زیـادڕەوی و جوڵەیـەکی ئـەم عەشیرەتە. تەنانـــەت لـــەخودی ناحیەکەشـــدا، لەکۆتایـــدا ســـوڵتان (عەبدولحەمیـدی دووەم) رەزامەنـدی خـۆی دەربـڕی بۆلێـدانی ئەندامەکانی ئەم عەشیرەتە.[1] هەر لەدرێژەی سیاسەتی دەوڵەتی

[1] عبدالله محمد العلياوي: سياسة الدولة الثمانيه تجاه العشائر الكرديه في

عوسمـــانی بەئاراســـتەی عەشـــیرەتە کوردییـــەکان، بـــەپێی بەڵگەنامــــــەی(ژمــــارە۲۹ی ڕێکــــــەوتی ۱۸۸۷/٥/۳ن) لەلایەن(ئیسماعیل حقی)یەوە لێپرسراوی کەرکوك، ئاماژە دەکات بە دادگایی کردنی عەشیرەتەکانی بەرزنجەو تاڵەبانی بەتۆمەتی هەستانیان بەسەرپێچی کردنی، لەدژی دامو دەزگاکانی دەوڵەت. هەستانیش بەکاری سەرپێچی کردن، مافی دادگایی کردنیان دەدا بەحکومەت، زاراوەی(الشغب)یش واتای سەرپێچی کردن دەگەیـــەنێ لەفەرمانـــەکانی دەوڵـــەت و کەمتەرخـــەمی لـــەدانی باجەکان و بەشداری نەکردن و سەرپێچیان لەسوپادا، هەر لەم میانەشدا حکومەت هیچ کەمتەرخەمییەك ناکات لەدژایەتی کردنیان و دادگایی کردنیان[1].

دەوڵـەتی عوسمـانی لەسـەردەمی سـوڵتان عەبدولحەمیـددا هـەوڵی بوژانـەوەی گیـانی مەزهـەب گـەرایی و سـۆفیگەرایی دەدا لـــەنێو کوردەکانـــدا. لـــەپێناو ســـنور دارکردنـــی ئاراســـتە نەتەوایـەتیان، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش دەوڵـەتی عوسمـانی هەسـتا بەکردنەوەی تەکیەو بنکەی دەروێشەکان لەهەڵەبجەو سلێمانی و کەرکوك و کۆیەو دابەش کردنی زەوی و زار بەسەر شێخەکانداو دانـــی ســـیفەتی پـــیرۆزی پێیـــان، لـــە کـــەرکوکیش کردنـــەوەی

- کرکـوك واطرافهـا مـن عـام(۱۸۸۷حتـى عـام۱۹۰۹)،(دراسـة وثائقيـة تحليليه)، جامعه صلاح الدين، كلية اداب، ص٥.

[1] د.عبدالله محمد العلياوي، سياسة دولة العثمانية تجاه العشائر الكردية في كركوك،ص٤.

تەکیەی(شێخ قادر) هەیە لەڕێکەوتی(١٩ی صفری ١٢٧٧ك) داو تەکیــەی(ســەید ئەحمـــەد ســـەردار خەلیفـــەی مەولاناخالیـــد نەقشبەندی) کە گەورەترین‌و بەناوبانگترین تەکیەی کەرکوك بوو، ناسراو بوو بەخانەقای(سەید ئەحمەد)، ئەویش لەماڵێکی گەورە پێك دەهـات رووبـەرێکی زۆری هـەبوو، بـەڵام وەقفەکـەی لەسـەر تەکیـەی شێخ قـادر بـوو بـۆ(مـصرف)و بـەڕێوەبردنی تەکیەکـە، ئەمانـــەش وەك ناوەنـــدێکی گـــەورەی(تەریقـــەتی قـــادری)* و(تەریقـەتی نەقـشبەندی)* لـەپێناوی سـەرهەڵدانی ململانـێ لەنێوان ئەو دوو تەریقەتـەداو هەوڵدان بۆ کۆکردنـەوەی خـەڵك‌و

---

* تەریقـەتی قـادری: ئـەم تەریقەتـە بـەناوی سـۆفی بـەناوبانگ(شـێخ عەبدولقادری گەیلانییەوە ١٠٧٧-١١٢٦)یە، کوردێکی خەڵکی لای گەیلانی کرماشــان بــوو لەکوردســتانی خۆرهــەڵاتی خــوارو، نــەوەی شــێخ عەبدولقادر،(عەبدولکەریمی گەیلانی١٣٦٦-١٤١٠) تەریقەتەکەی هێناوەتە کوردستانی ناوەڕاست، لەوێ شێخەکانی ئەمری رەچەڵەکی خۆیان بۆ ئەو دەبەنەوە، ئەم تەریقەتە تاوەکو سەدەی نۆزدەش تاکە تەریقەتی زاڵ بوو لەکوردستاندا. تەنانەت تائەوکاتەی تەریقەتی دیکەش پەیدابوون‌و جێگەی خۆیان گرت، تەریقەتی قادری پێگەی خۆی لەنێو کوردا هەرمایەوەو رۆڵی خۆی لەدەست نەدا.

* تەریقـــەتی نەقـــشبەندیش لەســـاڵی (١٨١١) لەلایـــەن(مەولاناخالیـــدی نەقـشبەندی)یـەوە گەیـشتۆتە سـلێمانی‌و هـەر زوویـش جێگـەی خـۆی لەکوردستاندا گرتووەو بووەتە رکابەری یەکەمی تەریقەتی قادری.(د.رەشاد میران: رەوشی ئاینی‌و نەتەوەیی لەکوردستان. ل٥٨-٥٩-٦١

شێخەکانی کورد، لەنێو ململانێی ئەو دووتەریقەتەدا، بەڵام ئەم جۆرە سیاسەتە لەوکاتەدا، لەشاری سلێمانی سەری نەگرت.[1]

لەگەڵ ئەوەشدا عوسمانییەکان بایەخ وگرنگیان بەوەدەدا کە رێبازی ئیسلام وەکو داردەستێك لەبەڕێوەبردنی کاروبارە کارگێڕییەکاندا بەئەنجام بگەیەنن و بتوانن بگەنە ئاکام. ئەنجامی بەرچاو بەپێی ئارەزووەکانیان بۆ چنینەوەی، ئەویش بەبەکارهێنانی هێڵی لەرینەوەی ئاین و دەمارگیری ئاینی، بۆ نموونە ئەگەر سەیری ناوچەیەکی وەکو ناوچەی کەرکوك بکەین کە هەر لەکۆنەوە جێگەی بڵاوبوونەوەی ئاینی مەسیحی* وئاینی ئیسلام و ئاینەکانی دیکە بووە، لەبەرئەوە جێیەکی گونجاو بوو بۆ کنەکردنی سیاسەتی دژەیەکتر لەنێو ئاینەکاندا، تەنانەت

---

[1] وەرگیراوە لە:د عمر ابراهیم توفیق: الترکمان في العراق، ل١٦١.

* لەدەڤەری موسڵ ئاینی مەسیحی بەخێرایی بڵاوبووەتەوەو چەندین خوێندنگاو دێری بەناوبانگی تیادا دامەزراوە چەندین کەسی ناوداریشی تیادا هەڵکەوتووە، کەرۆڵی گرنگیان بینیوە لە بڵاوکردنەوەو جێگرکردنی ئاینی مەسیحی لەم دەڤەرەدا.(مارسبریشوع)لەشارەزوور توانی ژمارەیەك لە کوردەکان بێنێتە سەر ئاینی مەسیحی. دانیشتوانی شاری(شهر کورد) شاری کورد-شرقاط، بت پەرست بوون. بەڵام دواتر بوونەتە مەسیحی و ئەسقەفەیەکی تایبەت بەخۆی هەبووەو جاروباریش دەسەڵاتی رۆحی بەسەر ئەسقەفیەی کەرکوکیشدا هەبووە، لەنێوان موسڵ و هەولێرو موسڵ و تکریتدا چەندین دێری لێ بووە. کەسایەتی(یەزدین شەمتا) خەڵکی شاری(کەرخ بێت سلۆخ-کەرکوك) بووە، جگە لەکاری ئاینی باجگری هەموو ناوچەکەش بووەو چەندین دێرو کڵێسەی دروست کردووە.(شوان عوسمان مستەفا: کوردستان و پرۆسیسی بەئیسلام کردنی کورد،ل١١٨-١١٩-١٢١.)

کارگەیشتووەتە ئەوەی کە لەنێو بۆتەی ئاینی ئیسلامەکەشدا، ئـاینزا(مـذهب) رۆڵـی کاریگـەری خـۆی بینیـوە لەتـەرازووی سیاسـەتی عوسمـانی و دەسـەڵاتدارانی ئێرانـداو بـەردەوام سـود بینراوە لە هەوڵدان بۆ هاوسەنگ کردنی ئەو تەرازووە سیاسییە بەبەکارهێنانی ئاینزای شیعەو سونی و لەتکردنی ئەم دوولایە بەشـێوەیەکی زۆر زیرەکانـەو مامەڵـەکردن لەگـەڵیان بـۆ جێبـەجێکردنی خواسـتەکانیان نـەك لەڕووانگـەی سـودی کۆمەڵایەتی نەتەوەکانی نێو شاری کەرکوك بەڵکو بەپێچەوانەوە، هەرلـەم رووەوە هـەوڵیان ئەدا ئـەوەی لەهێڵـە سـتراتیژەیەکەیان نزیـك ئەبـووەوە زیـاتر ئەکەوتنـە بـەکارهێنانی ئـەو لـەرە ئاینیـە لەناوچەکانی(داقوق)و(دوز) کە باشترین بەڵگەی ئەم راستیەن، لەبەرئـەوەی جێگەیـەکی لەبەرچـاوی نزیـك بوونـەوە لەهێڵـە نەتەوەییەکەو نزیکی سنورە لەگەڵ قەڵەمڕەوی سەفەوییەکاندا. ئەوڵەتی عوسمانی بەردەوام هـەوڵی ئەدا ئاینـەکان بەکاربهێنێت بـۆ بەربـەرەکانیکردنی یـەکتری. بەنموونـە هەسـتابوون بـە بـەکارهێنانی کڵێـسەکانی وەك(کڵێـسە سـورەکە) بـۆ شـوێنی خـۆراك و کڵێـسەکانی سـەر قەڵایـشیان بـەکارئەهێنا بـۆ نەخۆشـخانەی سـەربازی، کـە ئەمـەخۆی لەخۆیـدا بـەکاربردنێك بـووە بـۆ بـەکارهێنانی بەربـەرەکانی ئـاینی، تالـەو رێگەیـەوە کاریگـەری خـۆی بەدەسـتبهێنێت و بیکاتـە بنکەیـەکی پێوانـە لەتەرازووی زۆری وکەمی و ڕێژەی ئاینەکان لەنێو شارەکەدا.[1]

---

[1] وەرگـیراوە لـە: سمکـۆ بـەهرۆز محمـد: ئەروازەیـەکی مێژووییانـە بـۆ-

تێڕوانینیان بۆ پەیڕەوانی شیعە مەزهەب، کە لە چەند ناوچەیەکی سەر سنوری دەوڵەتەکەیان نیشتەجێ بوون لەوانە ناوچەکانی هەکاریو خانەقینو بەدرەو جەسان بە درێژایی سەردەمی دەسەڵاتیان وەك کۆمەڵێکی دۆستو هاوکاریکەری بنەماڵە فەرمانڕەواکانی ئێران سەیر دەکرانو هەمیشە تاوانی ئاژاوەگێڕیو هاوکاریکردنی دەسەڵاتدارانی ئێرانیان خرابووە پاڵ، ڕاستییەکەشی هەر وا بووە چونکە ئەوان دانیان بە دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیدا نەنابوو لە یەك کاتیشدا دووجار وەك داگیرکەر سەیریان دەکرد، جارێك وەك داگیرکەری خاکەکەیان و جارێکی دیکەیش وەك داگیرکەری پەیڕەوەکەیان[1].

سەپاندنی ناوی عوسمانیش بەسەر سەرجەم دانیشتوانی دەوڵەتی عوسمانیدا، دان نەنان بەئازادی تاكو دانانی ئیسلام بەئاینی دەوڵەت، دەوڵەتیش چاودێرو پارێزگاریکەری هەموو ئاینەکانەو دەبێت دانیشی پێدابنێن.[2] سوڵتان عەبدولحەمید (١٨٧٦-١٩٠٨ن) خەلیفەیەکی زۆرداربوو، دژی هەموو جۆرە سەربەستیو سەربەخۆییو ئازادیەك بوو لەوڵاتدا. هەموو

---

-ڕووداوەکەی ساڵی ١٩٥٩ی شاری کەرکوك، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە٢ی ساڵی پێنجەم، پایزی ٢٠٠٣، ل٥٥-٥٦.

[1] کەیوان ئازاد ئەنوەر: سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی لە کوردستاندا، گۆڤاری پەیڤین، ل ٢٢٥.

[2] کارل بروکلمان: تاریخ الشعوب الاسلامیە، ت.نبیە امین فارس، طبعة الاولی، بیروت-لبنان-٢٠٠٠،ص٥٨٦.

دەسکەوت و سامانی ولاتی بەفیڕۆ ئەداو ئەیدا بەدەست و پێوەندەکانی لەپێناو پاراستنی کورسی و دەسەلاتەکەیدا. ئەوانیش بەویست و ئارەزووی خۆیان یارییان بەپاشەڕۆژی ئەویش و ولات و نەتەوەکانی دیکە دەکرد.[1] سیاسەتی تورکیش، کە گەورەکانی تورك پەیڕەویان لێوە دەکرد لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا دژی کەمینەکان بوو. ئەمەش ببووە هۆی دروستبوونی کاردانەوەی پێچەوانە لەدژی ئەو سیاسەتە.[2] بایەخی دەولەتی عوسمانی لەم ڕووەوە هەولدان بوو بۆ قۆستنەوەی نەتەوەکانی نێوشارەکە لە کوردو ئاسوری و ئەرمەنی و نەتەوەی دیکە، هەر لەبەر ئەمە هەولی سیاسەتی(الفرق التسد) یان ئەدا تابتوانن لەپاڵ ئەو سیاسەتەوە مەرامەکانی خۆیان بەئەنجام بگەیەنن، کە مێژوەکەیان لەناوچەیەکی وەکو کەرکوك زۆر بەروونی بەدیار دەکەوێت. سەرەڕای ئەوانەش بەردەوام هەولی ئەوەیان ئەدا بکەونە دروستکردنی چینێکی کۆمەلایەتی، کەبتوانن بگەنە بەرزترین پلەی کۆمەلایەتی و ئەرئەنجامی کاروبارە بەڕێوەبەری و کارگێرییەکانی پێ بەڕێوەبەرن، ئەوچینەش بکەنە ژێر رکێفی بیروڕای عوسمانی و تورکچێتی و دەمارگیری نەتەوەیی

[1] ڕەمزی قەزاز: بزوتنەوەی سیاسی و ڕوشنبیری کورد،(لەکۆتایی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستدا)، سلێمانی-١٩٧١، ل ٦٣-٦٤).

[2] عبد ربه سكران ابراهيم الوائلي: اكراد العراق(١٨٥١-١٩١٤)، دراسة في تاريخ الاقتصادي والاجتماعي والسياسي، كلية الاداب، جامعة قاهره،١٤٠٧هـ-١٩٨٧م، ص٢٩٨.

بۆجێبەجێ کردنی مەرامەکانیان کە دووربێت لەبیرکردنەوەی راستی رۆشنبیری نەتەوەیی، وەکو یەکێکی کوێر تەنها ئەوەی پێی رادەسپێرن جێبەجێی بکات و چاولەبەرژەوەندییە شەخسییەکان بپۆشێت. ئەم بۆچوونانەش لەبزووتنەوەی تورانچێتی، رەنگی داوەتەوە کە لەسالانی کۆتایی دەولەتی عوسمانیدا پێرەوی لێوە دەکرا.[1] لێرەدا سیاسەتی(بەعوسمانیکردن- عثمنە)و(بەتورک کردن- تتریک) بەرامبەر کەمەنەتەوەکان پێرەو دەکراو ئامانجیشی ئەوەبوو ئەو کەمایەتییانە لەبۆتەی بەتورککردندا بتوێنێتەوە.[2] یەکێك لەوهۆکارە کاریگەرانەی رۆلی بینی و رەگی تاماوەیەکی دووروودرێژ لەدەولەتی عوسمانیدا داکوتاو پاشتریش مایەوە جولانەوەی تورانییەت بوو، کە دەرئەنجامێکی زۆر بەهێزی دروست کرد لەبۆتەی چینایەتی و کۆمەلایەتی شاری کەرکوکدا، تورانیەتیش جولانەوەیەکی بەرتەسکی نەتەوەییەو لەکۆتایی سەدەی نۆزدەدا نیشانەکانی دەرکەوتن مەبەستیشی ئەوە بوو ئەو نەتەوانەی ژێر دەسەلاتی دەولەتی عوسمانی کە تورك نەبوون بیانکات بەتورك و پاشانیش شێوازێکی نوێی وەرگرت و، لەماوەی دەسەلاتدارێتی عوسمانییەکان لەناوچەکەدا بانگی

---

[1] سمکۆ بەهرۆز محمد: دەروازەیەکی مێژووییانە بۆ رووداوەکەی سالی ١٩٥٩، ل٥٣.

[2] د. ولید حمدی: کوردوکوردستان لەبەلگەنامەکانی بەریتانیادا، و.محمد نوری تۆفیق. سلێمانی-١٩٩٩، ل٢٣.

ئەکرد بۆ یەکخستنەوەی تورانی نیشتمانی، بووە هۆی توانەوەی نەتەوەکانی شاری کەرکوك لەنێو بۆتەی بەتورك کردن و هەرەسهێنانی پەیوەندی نێو کەمەنەتەوەکان، ئەمەش زیاتر خۆی لەکاریگەری چەند فاکتەرێك دەبینییەوە. کە گرنگترینیان لە شاری کەرکوکدا لەژێر کارتێکردنی دەسەلاتی سەربازی و سیاسی و کارگێڕی و رۆشنبیری تورك بووە، هەروەها سەرهەلدانی چینێکی گەورەی سەرمایەداری موڵکداری لەنێو تورکمانەکاندا، بەهۆی داگیرکردنی بازاڕەکانی شاری کەرکوك و رازیکردنی بەشێك لەچین و توێژی کورد لەبەشداریان بۆ بەرگریکردن لەبەرژەوەندییەکانی ئەو خاوەن موڵکانە، هەر بۆیە دەسەلاتی توركی زمانی چینی ئەرستۆکراتی بەسەر زمانی بازاڕی ناوخۆی شارەکەدا سەپاندبوو. کە هەر لەسەردەمی عوسمانیەکانەوە زەمینەیەکی گەورەی دروست کردبوو بۆ بلاوبوونەوەی زمان و کەلتوری تورکی.[١] بەمجۆرە لەسەردەمی عوسمانیەکاندا دانیشتوانی کوردی شاری کەرکوك کەناگیربوون و لەهەموو پلەوپایەیەکی میریدا، بێبەش کرابوون، تەنانەت زەوی وزاری گوندو لادێکانی دەوروبەری شاریش لەسەر خەڵکانی غەیری کورد بەتایبەتی عوسمانی تاپۆ دەکران.[٢] هەر

---

[١] وەرگیراوە لە: سمکۆ بەهرۆز محمد: دەروازەیەکی مێژووییانە بۆ رووداوەکەی ساڵی ١٩٥٩ی شاری کەرکوك. ل ل٥٤-٥٥-٥٧.

[٢] وەرگیراوە لە: موعتەسەم ساڵەیی: کێشەومێژووی شاری کەرکوك، ل١٠٢.

لەوماوەیەشدا خێزانە ناودارەکان لەسەرجەم ئەو شوێنانەی کەببووە شوێنی نیشتەجێ بوونی بەردەوامیان دەبوایە نازناوێکی تورکیان هەڵگرتایە.[1]

زۆرداری و رووتانەوەی رژێمی دەرەبەگایەتی لە کوردستاندا سروشتێکی تایبەتی سەبارەت بە میللەتەوە هەبووە، ئەو میللەتەی پێکهاتبوو لەجۆرەها دانیشتوان، واتە ئەوانەی بەزەوی چاندنەوە خەریک بوون و لەتەك ئەوانەشدا نیوە کۆچەرو هەروەها ژیانی عەشیرەتیش هەبوو.[2] رژێمی باجگریش لە دەوڵەتی عوسمانیدا بەری سەدەها ساڵانی ناتەواوی و کەموکوڕی رژێمێکی کۆمەلایەتی و ئابوری و چینایەتی و ئەنجامی سەدان فەرمان بوو کە سوڵتانەکان بەسودی خۆیان و دەست وپێوەندو کاربەدەستەکانی دەوروبەریان دەریان کردبوو، بەئارەزووی خۆشیان زیادە رەوییان لەو رژێمەدا دەکرد، وەك لەدۆخی ناوچەکەوە هەڵقولابێت و پەیوەندی بەشەریعەتی ئیسلامەوە هەبێت، لەتەك ئەمجۆرە باجانەش پەرەسەندنی دەردی بیرۆکراتیەت وەك نەخۆشیەکی کوشندەی بێچارە سەر گیان ولەشی دەوڵەتی عوسمانی و گشت دەزگاکانی پەکخستبوو.[3] ئەو سەردەمە جگە لەباج و سەرانەی دەوڵەت،

---

[1] ستیڤنس.هـ.لونگریك:اربعة القرون، ص٣٢٥.

[2] جەلیلی جەلیل: کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، ل٦٨.

[3] د.کاوس قەفتان: یاسای باجگری و دۆخی ئابوری ناوچە کوردییەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەسەدەی نۆزدەدا، ل٥٨.

سەربازو موچەخۆرو فەرمانبەرانیش کە موچەکانیان بەچەند مانگ دوادەکەوت، مەفرەزەی سەربازی لەپێناو دابینکردنی موچەدا دەچوون بۆ کۆکردنەوەی بەروبوومی کشتوکاڵی، جاروباریش لەبری پارە مەڕوبزنیان دەدا بە فەرمانبەران.[1] هەر بەم پێودانگە ئەگەر سەیری ناوچەیەکی وەکو کەرکوک بکەین هەردەم جێگای بەربەرەکانی و سەپاندنی جۆرەها باج و باجگری دەوڵەتی عوسمانی بووەو بەردەوام کەوتبووە بەردەم سەپاندنی جۆرەها باج کەهەمووی لەبەرژەوەندی چینی دەسەڵاتداردا بوو، ئەوانیش وەك باجەکانی جوتانە، چالانە، سەرانە، مەڕانە، کەرانە، مریشکانە....هتد کەهەریەکە بۆ مەرامێکی دیاریکراوو لەسەردەمی جودادا بەکارهاتووە، هەریەکەشیان کارتێکردنێکی تایبەتی خۆی لەشارەکەدا هەبووە.[2]

زۆربەی کاتیش ئەمانەیان بەزۆر لەخەڵکی سەندووە هەروەکو لەم پارچە شیعرەی شێخ رەزاوە زیاتر بۆمان دەردەکەوێت:-

قەومەکان بەو زاتە واحوکمی لەسەر بەحروبەرە
بەرخە نێرێ گەر نەنێرێ هەر کەسێ خاوەن مەڕە

---

[1] ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: شاری سلێمانی، چاپی یەکەم،چاپخانەی زانست، سلێمانی٢٠٠٢، ل ل ٤٣-٤٤.

[2] وەرگیراوە لە: سمکۆ بەهرۆز محمد: دەروازەیەکی مێژوویانە بۆ رووداوەکەی، ل ٥٤-٥٥.

دێـــــم بەگژیا دەیدڕم گەر(في المثل) شێری نەرە
بـــــانەقەومێت و نــەزانن ئەم هەموو شۆڕوشەرە
گشت لەسەر بەرخی شەل و کاوڕی لەڕو بزنی گەرە.[1]

بەمجۆرە دەبینین ڕژێمی ئابوری باجگری ئەو وولاتە لەسەر بناغەی دەرەبەگایەتی و خێڵایەتی دامەزرابوو کە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە جیاواز بوو بەهۆی پەیوەندی خێڵەکییەوە.[2] بـاری زۆرداری کۆمەلایـەتی و ئـابوری سـەرەك عەشـیرەتەکانیش ئەوەندە قورس وگران ودیـار بوو. لەگەڵ ئەوەشدا بـەهیچ جۆرێك بیریـان لـەوە نەئەکردەوە بیشارنەوە، هـەر لـەم بارەیـەوە خورشید ئەفەندی کەیەکێك بوو لە نوسەرە تورکەکانی سـەردەمی دەوڵـەتی عوسمانی دەنوسێت:" بۆسودی خۆیان زۆر شتیان لـە تایەفـەکان کـۆدەکردەوە و لەسـەر هـەموو جـۆرە دواکـەوتنێکی باجـدانیش جوتیارەکـان سـزا دەدران و ئـەو سـزایە بەشـێوەی پـارە لێیـان ئەسـێنرا"[3] لەفاکتـەرەکانی جوڵانـەوە کوردێکـانیش لەمەنـدێك کاتـدا، داواکـاری زۆری باجـەکانی دەوڵـەتی عوسمـانی بـووە، کوردەکـان ناچارکرابوون بـەدانی بـاجێکی زۆر، نـەك تـەنها لەبـەر ئـەوەی قـورس بووبێـت لەسـەر شـانیان، بـەڵکو لەگـەڵ ئەوەشـدا بـەهیچ جۆرێـك بەسـودی ئەوانـە نەئەگەڕایـەوەو هـیچ پاداشـت و

---

[1] شێخ محمد خال: دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، ل٨٤.

[2] وەرگیراوە لە: ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: شاری سلێمانی، ل٢٦.

[3] د.جەلیلی جەلیل:کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، ل٦٧.

قەرەبوویەکیشیان وەرناگرت بۆئەو ماڵەی ئەیاندا. ئەمانەو لەگەڵ نەبوونی رێگاوبانی باش لەهەرێمە کوردێکانداو نەبوونی خوێندەواری‌و کاری جۆگەو ئاودێری بۆ گەشەی کشتوکاڵی‌و لەهەمان کاتدا دەبوایە هەستانایە بەدانی باجێکی زۆرو بەردەوامیش دەبوایە ئامادەیی دانی ئەو باجەیان تیادا بوایە.[1]

هەر لەساڵی (١٨٣٠ز) بەدواوە چەندین بنکەی سەربازی دەوڵەتی عوسمانی لەکوردستاندا بەدەرکەوت.[2] بۆ ئەم مەبەستەش دەوڵەتی عوسمانی هەستا بەدروست کردنی رێگایەکی زۆر کەبە(رێگاکانی سوڵتان) ناسرابوون. بەنیازی پارێزگاریکردن لەرێگای کاروانە بازرگانیەکان‌و دابین کردنی پێداویستیە سەربازییەکان لەکاتی خۆیدا.[3] لەدوای گەڕانەوەی هێزەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەجەنگی روسیای ساڵی (١٨٧٧-١٨٧٨ز) چەندین بنکەو قوللەی سەربازییان بەدرێژایی رێگاکانی بەلەدوزو خاڵس‌و کەرکوک. لەباشوریش لەنێوان بەغداو حلەو شوێنە پیرۆزەکان دامەزراند.[4] لەسەرەتاوە ئەندامەکانی حامیەی سەربازی عوسمانی بەدانیشتوانی کەرکوک ئەژمارنەدەکران. بەڵکو لەناوچەکەدا بێگانە بوون بەتایبەتی لە قۆناغەکانی یەکەمی بوونی بنکەی سەربازی عوسمانی لە کەرکوک، پاش

[1] عبدربەسکران ابراهیم الوائلی: اکراد العراق. ص ٢٥٣.

[2] د. عبدالرحمن قاسم لو: کردستان والأکراد. ص ٤٦.

[3] د.عمر ابراهیم توفیق: الترکمان في العراق. ص١٥٩.

[4] لیلی نامق جاف: کرکوك لمحیات التأریخیة. ص٤٠

تەواوبوونی خزمەتی سەربازیشیان دەگەڕانەوە بۆ شارەکانی خۆیان.[1] خوێندنگاکانی عوسمانیش ناوەندی دەرچوونی کاربەدەست و جەندرمەکان بووە، بەهۆی ئەو متمانە گەورەیەی کە تورکمانەکان هەیان بوو، پایە گەورەکانی سەربازی و کاروبارو دەزگاکانی بەڕێوەبردن زیاتر لەنێو ئەواندا بەدەست دەهات. لەهەمان کاتدا کاریگەری گەورەیان کردە سەر زەوییە کشتوکاڵیەکان، لەم میانەشدا( باب العالی) هەڵدەستا بەدابەش کردنی زەوی و زاری کشتوکاڵی بەسەر ئەو سەربازانەدا*، بەمجۆرە سەرهەڵدانی دەرەبەگە تورکمانەکان و نیشتەجێی بوونیان لەناوەندەکانی کەرکوک و هەولێردا بووە هۆی ئەوەی، ببن بەخاوەنی رووبەرێکی بەرفراوان لەزەوییە کشتوکاڵیەکان.[2]

دەوڵەتی عوسمانی لەکەرکوکدا سیاسەتێکی تایبەتی دابەشکردنی زەوی و زاری بەسەر داموەدەستەکەیدا پەیڕەو دەکرد، بەردەوام هەوڵی ئەوەی دەدا ئەوکەسانە لەخۆی نزیک بکاتەوە کە توانای سەرکوتکردنی خەڵکیان هەیەو پاشان

---

[1] د.جبار قادر: قرن ونصف من التتريك والتعريب، گۆڤاری کەرکوک، ژمارە(١)ی ساڵی پێنجەم، هاوینی٢٠٠٣، ل ١٩٤.

* ئەو زەوی‌وزارانەی، میری لەپاداشتی خزمەتی سەربازی بەخەڵکی دەبەخشی پێیان دەوترا(ئۆجاغلك یان یۆرتۆڵك)، دوایی ئەم جۆرە زەوی‌و زارانەش وایان لێهات پشتاو پشت بۆنەوەکانی دوای خۆیان بمێننەوە.(د.جەلیلی جەلیل: کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، ل ٢٩٨).

[2] وەرگیراوە لە: د.عمر ابراهيم توفيق: التركمان في العراق، ص١٦٢.

بەستنەوەیان بەدەسەلاتی دەوڵەتەوە. هەروەکو لەوەدا دەبینین زەویوزارێکی زۆر بەسەر(ئاوچی)یەکان دابەشکرابوو کە لەکاروبارە کارگوزارییەکانی شارەکەداو ئەوە لەدوای ئەوەش بەمیرات بۆیات دەمایەوە. خێزانی ئاوچییەکانیش بەو پێیە زەوییەکانیان دابەشکردبوو بەسەر کارمەندەکانی بەڕێوەبردنی کاروباری زەوییەکانیان، لەهەمان کاتیشدا هەڵدەسان بەجێبەجێکردنی کاروباری زەوی لەرووی کۆکردنەوەی بەروبوومە کشتوکاڵیەکان و گەیاندنی ئەم بەروبوومانە بۆ خاوەن موڵکەکان. بۆیە لەشارەکەو کۆمەڵە زەوی و زاری لادێ و گوندەکان لەژێر سایەی، رژێمێکی دەرەبەگایەتی لەلایەن ئاغایەکەوە یان چەند ئاغایەکەوە بەڕێوە دەبرا.[١] کاتێکیش لەساڵی (١٩٠٨ز) دا کودەتای (ئیتیحادو تەرەقی)[*] روویدا،

---

[١] وەرگیراوەلە: سمکۆ بەهرۆز محمد، دەروازەیەکی مێژوویانە بۆ رووداوەکەی...ل٥٤.

(*) ئەم رێکخراوە خوێندکارێکی ئەلبانی لە ساڵی (١٨٨٩ز) دایمەزراند، سەرەتا کورد لە دامەزراندنی ئەو رێکخراوە نهێنیەدا رۆڵی گرنگ و لەبەرچاوی بینی. ئەو خوێندکارە ئەلبانییەش ناوی (ئیبراهیم تیمۆ)یە، دوو کەس لە هاورێیانی کورد بوون ئەوانیش (ئیسحاق سکوتی) لە دیاربەکرو (عەبدوڵلا جەودەت) لە عەرەبکیر، سەرەتا رێکخراوەکەیان ناو نا (تەرەقی و ئیتحادی)، ئەو چوار خوێندکارەشی ناوکی کۆمەڵەکەیان پێکهێنا (ئیبراهیم تیمۆ، ئیسحاق سکوتی، عەبدوڵلا جەودەت، محەمەد چەرکەسی)، هیچ یەکێك لەو چوار کەسە تورك نەبوون، ئامانجی ئەم کۆمەڵەیە گۆڕینی ئیدارەی عوسمانی و دورخستنەوەی سوڵتان (عەبدولحەمیدی دووەم)بوو، ئەوان دەیانویست ئیرادەیەکی نوێ و سوڵتانێکی نوێ و دادپەروەر دابنێن

هەرچەندە ئەم کودەتایە نمونەی حوکمێکی ڕاستەوخۆی تورکی بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەرەتاو دەستپێکی لابردنی هەندێك لەباجەکان دەستی پێکرد، دووبارە دابەش کردنەوەی زەوی و زار بەسەر جوتیاراندا بەبێ پشتگوێ خستنی مافی خاوەن موڵکەکان هەروەها ڕێکخستنەوەی پلەو پایە سەربازییەکان.[1] لەدوای کودەتای ساڵی (١٩٠٨)ی ئیتیحادو تەرەقییەوە(عەونوڵا کازمی)*[2] بە موتەسەریفی

---

کە بە یەکسانی سەیری سەرجەم گەلانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی بکات. (د. عەبدوڵا عەلیاوەیی: کوردستان لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا، ل ١٨٠ ١٨١).

[1] حنا بطاطو:العراق، ص٢٠٠-٢٠١

(*) عەونوڵا کازمی (١٨٦٨ -١٩١٤ز): یەکێکە لە تێکۆشەرانی سەردەمی سوڵتان (عەبدولحەمیدی دووەم) بە ڕۆژنامەوانی حیزبی ناسرابوو، ناوی ڕەسەنی خۆی (محەمەد سەلیم)ە، بەڵام لەبەر ئەوەی بەنازناوی (عەونوڵا ئەلکازمی)یەوە نووسراوی بڵاو کردۆتەوە هەر بەو ناوەیشەوە ناسراوە. بە ڕەسەن خەڵکی (ئەرزروم)ن باپیری دەرەبەگێك بووە ناوی (عەلی بەگ) بووەو بە(ڕۆزڵۆ خان خانی بەهێز) ناسراوە. لە ئەستەمبوڵ هاتۆتە دنیاوەو زمانەکانی عەرەبی و فارسی و فەرەنسی فێر بووە، لە ساڵی (١٨٨٩ز)دا کاتێك لەگەڵ (تۆفیق بەگ)ی برایدا ڕۆژنامەی ڕۆژانەی (مرورت)ی دەرکردووەو- -لەسەر وتارێك زانیویانە دەگیرێن، بۆ دەرەوەی وڵات هەڵهاتوون و (محەمەد سەلیم) دوای ئەم هەڵهاتنە بەناوی خواستراوی (عەونوڵا کازمی)یەوە گەڕاوەتەوە وڵاتی خۆی، لە ساڵی (١٩٠١ز) دا لە پلانێکی سیاسی سەرنەگرتوودا گیراوەو حوکمی هەتا هەتایی بە توندی دراوەو نێردراوەتە (سیواس). لەوێش لەبەر ئەوەی هەوڵی هەڵهاتنی داوەو

کەرکوك دانرا.[1] پاشان زۆر لقی ئەم کۆمەڵەیە لەعێراقدا، لەوانە لە کەرکوك‌و هەندێ شاری تر کرایەوە. مامۆستا مستەفا نەریمان بەمجۆرە باس لەرۆژانی کۆمەڵەکە دەکات‌و دەڵێت:" هەوای سەربەستی‌و ئازادی ناوچەکەی گرتەوە، خوالێخۆشبوو(مستەفا ئەفەندی مال اللە خەڵەف) کە بە(مستەفا رێژی) ناوبانگی دەرکردبوو، لقێکی لە کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی لەشاری کەرکوك کردەوە، دەیان کەسی لەگەڵ بوو، بڵاوکراوەکانی ئەو رێخراوەش لە ئەستەمبوڵەوە دەگەیشتە دەستیان. مستەفا مال اللە خەڵەف لەسەردەمی عوسمانیەکاندا مەئموری گومرگ رێژی بووە. کۆمەڵە کە پاشتر پەیرەوی رێگای شۆڤێنیان گرت‌و،

---

پاشتر نێردراوەتە قەڵای سینۆپ‌و لەوێ بەند کراوە، لە کودەتای ساڵی-(١٩٠٨ن)دا گەڕاوەتەوە ئەستەمبوڵ کتێبی (دوا بەرگری) نووسیوە. لەو رۆژانەدا بۆتە سەرۆکی رێکخراوی کۆمەڵەی (فیداکارانی میللەت) پاشان دەستی بە بڵاوکردنەوەی (حقوقی عمومیە مافە گشتییەکان) کردووە. کە دژ بە کۆمەڵەی ئیتحیادو تەرەقی بووە. پاشتر بوختانێکیان بۆ رێکخستووەو کۆمەڵەی فیداکارانی میلەتیان هەڵوەشاندۆتەوەو ئەمیشیان گرتووە. لە ئەنجامی دادگاییکردنیدا بێتاوان بڕیاری لەسەر دراوەو کراوەتە موتەسەریفی کەرکوك. بەڵام لەو دەمانەدا یاخیبوونی (٣١ی مارت) بەرپابووەو وا دانراوە ئەمیش دەستی تێدا بووبێ‌و دیسانەوە گیراوەتەوە، ئەمجارەش لە (دیوانی عورفی جەنگی)دا بێتاوانی سەلمێنراوەو بە-موتەسەریفی گەڕاوەتەوە کەرکوك‌و پێنج ساڵ لەوێ ماوەتەوە. (بەشێك لەیاداشتی عەنوڵا کازمی،و. لەتورکیەوە: ئەحمەد تاقانە، گۆڤاری کەرکوك ژمارە(٤)ی ساڵی پێنجەم، بەهاری ٢٠٠٤، ل ١٠٥.)

[1] بەشێك لەیاداشتی عەنوڵا کازمی،و. لەتورکیەوە: ئەحمەد تاقانە، ل ١٠٣.

لەکاتی بەستنی کۆبوونەوەکانیادا مەراسیمی تایبەتیان هەبوو بۆ وەرگرتنــی ئەندامــە نوێیــەکانیان، بــەڵام لەدوایــدا کۆمەڵــە کــە لــەرێڕەوی خــۆی لایــدا ئــەویش پــاش ئــەوەی لەســاڵی (١٩١١ن) بەتەواوەتی حوکمیان گرتە دەست، تورکچێتی خۆیـان راگەیاندو کەوتنە لێدان و لەناوبردنی خەڵکی بەرێگای نامرۆڤانە، تەنانەت زۆرکـات بـۆ ئەومەبەسـتەیان پـەنایان دەبـردە بـەر بـەکارهێنانی هێز.[1]

---

[1] وەرگیراوە لە ئەڕی: ئەوکۆمەڵەو رێکخراوو حزبانەی لەناوچەی کەرکوک سەریان هەڵداوە، گۆڤاری کەرکوک، ژمارە(٣)ی ساڵی دووەم، زستانی٢٠٠١، ل٧٤.

# باسی یەکەم

## ڕەوشی خوێندن و فەرهەنگی شاری کەرکوك

لایەنی ڕۆشنبیری و خوێندن یەکێك بووە لەلایەنە دواکەوتووەکانی ژیان، ڕووداوێکی سەیرو سەرنج ڕاکێش نییە. بۆ ئەو سەردەمەو دواکەوتوویی دەوڵەتی عوسمانی ئەگەر ڕۆشنبیری و خوێندن دواکەوتووبوبێت لەو سەردەمەدا حوجرەکان ناوەندی خوێندن و خوێندەواری بووە، هەر لەم سەردەمەدا خوێندن تەنها بۆ چینی دەسەڵاتدارو دەوڵەمەندو دەرەبەگەکانی لەڕەگەزی نێرینە سنوردار کرابوو، ئەمەش زیاتر بۆئەوە دەگەڕایەوە کە دەوڵەتی عوسمانی خۆی بەبەرپرسیاری خوێندن و ڕۆشنبیر کردنی خەڵکی نەدەزانی و ئەو ئەرکەیان زیاتر

بۆ كۆمەلانی خەلك بەجێهێشتبوو.[1] لەوڕۆژگارەدا ناوەندی دەسەلات لەدەوڵەتی عوسمانیدا تادوائەندازە لەخوێندەواریو ڕۆشنبیری دەترساو ئامادە نەبوو بەهیچ شێوەیەك لای لێ بكاتەوە، چونكە ئەوكاتە پیاوانی ئاینی خاوەن دەسەلاتودەستڕۆیشتوو بوون لەناوەندەكانی بڕیارەوە نزیك بوونو ڕۆلی گەورەیان لەدەركردنی بڕیاری سیاسیدا هەبوو، كەزۆرجار سوڵتانەكانی عوسمانی خۆیان پێشڕەوی ئەو ڕەوتە كۆنە پەرستانەیان دەكرد.[2] پشتگوێخستنی بارودۆخو لایەنەكانی دیكەی ژیانیش لەكوردستاندا كاریگەرییەكی نێگەتیڤی لەسەر بارودۆخە ڕۆشنبیرییەكە هەبوو.[3]

دەوڵەتی عوسمانیش هەر جۆرە باجو سەرانەیەكی وەردەگرت، بۆ خزمەتی پەروەردەو خوێندنو هیچ جۆرە خزمەتێكی دیكەی تەرخان نەدەكرد.[4] سەرجەم دەركەوتە كۆمەلایەتییەكانیش جۆرە ڕۆشنبیرییەكی تێدا بەدیدەكرا، بەشێوازێك ئەو ڕۆشنبیرییە لەسیاسەتەكانی دەسەلاتی مەركەزەوە سەرچاوەی دەگرتو ئەم سیاسەتانەش سیمایەكی تایبەتی لەخۆگرتبوو كە تایبەت بوو بە سروشتی ئەو

---

[1] كەیوان ئازاد ئەنوەر: چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی نوێو هاوچەرخی گەل كورد، ل٤٦.

[2] ئاكۆ عەبدولكەریم شوانی: شاری سلێمانی، ل٥٤.

[3] كامران عبدالصمد احمد دوستكی: كردستان العثمانیه،ص٤٧.

[4] علی تەتەر تۆفیق: ژیانا سیاسی لكوردستان، ل١٨.

دەسەڵاتە.[1] ئەم بارودۆخی پشتگوێخستنی خوێندنە لەهەرسێ ویلایەتەکەدا(موسڵ، بەغدا، بەسرە). تا ساتەوەختی هاتنی(مەدحەت پاشا ١٨٦٩-١٨٧٢ن) وەك والی بەغدا، بەردەوام بوو. ناوبراو لەگەڵ هاتنیدا دەستی دایە ریفۆرم‌و چاکسازی بەشێکی چاکسازییەکانی ئاوڕدانەوە بوو لەخوێندن‌و خوێندەواری. ئەمەش بەهۆی چەند گۆڕانێکی گرنگی بارودۆخی نێودەوڵەتی عوسمانییەوە، هاتۆتە کوردستان‌و عێراقی ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەوە. کە لەئەنجامی کارتێکردنی سیاسەت‌و رۆشنبیری ئەوروپا بووە، بۆ سەردەوڵەتی عوسمانی هەرچەندە ئەوبڕە چاکسازییە سەرزارەکیانەی دەوڵەتی عوسمانی ئەنجامی دەدا، بەتەمای ئەوەبوون وڵاتەکەیان لەدواکەوتن‌و خۆیشیان لەڕووخان رزگاربکەن، بەڵام چاکسازییەکانی مەدحەد پاشا بۆی نەکرا، چونکە کارێکی ئەوەندە ئاسان نەبوو ئەو بناغە سیاسی‌و ئابورییەی لەماوەی سەدەها ساڵدا دروست ببوو ئەو دەوڵەتەی لەسەر وەستابوو بگۆڕدرێت، دەوڵەتی عوسمانیش نیازی لەم چاکسازییە رووکەشیانە ئەوەبوو کەزیاتر دەسەڵاتی خۆیان بەسەر میللەتانی دیکەدا بسەپێنن‌و روخسارێکی نوێتر بدەن بەئیمپراتۆریەکەیان، ریفۆرمەکانی مەدحەد پاشا تارادەیەك کاریگەری هەبوو بۆسەر رەوتی خوێندەواری‌و فێرکردن لەم

[1] د.حسين الضيقه: الدولة العثمانية،(دراسات الاجتماعية والسياسية)، طبعة، الأولى، بيروت-لبنان، ١٤١٧هـ-١٩٩٧م،ص ٥٥.

ولاّتەدا، چونکە بەرلەهاتنی ئەو هیچ خوێندنگایەکی نوێ لەسێ ویلایەتەکەدا نەبوو.[1]

سەرباری ئەمانە بوونی کەسایەتییەکی مۆدێرنخوازی وەك (مەدحەد پاشا ١٨٦٩ - ١٨٧٢ز) بە والی عیراق گەشەی بە چاکسازییەکان لە هەر سێ ویلایەتەکەی عیراقدا دا، (مەدحەد پاشا) لە ماوەی کورتی دەسەلاّتیدا زۆر کاری گرنگی ئەنجامدا لە بواری یاسای زەوی و بەرزکردنەوەی ئاستی بەرهەم و کردنەوەی کەناڵی سوێس، رێکخستنی گواستنەوەی دەریایی، راکێشانی هێڵی شەمەندەفەر، دابینکردنی ئاسایشی هێڵەکانی گواستنەوە بۆ برەودان بە بازرگانی و جوڵەی سەرمایە، چاکردنی باجەکان بەگوێرەی پێداویستی گەشەی بەرهەمی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵ، زیادکردنی زەوی کشتوکاڵ، کردنەوەی قوتابخانە، دەرکردنی رۆژنامە، ئەمانە بەشێك بوون لە دەستکەوتەکانی ماوەی کورتی دەسەلاّتدارێتی (مەدحەد پاشا) لە سێ ویلایەتەکەی عێراقدا، هەرچەندە ماوەی دەسەلاّتدارییەکەی زۆر نەبوو دوای دوو ساڵ لە بەغدا نەفی کرا، بەلاّم هەرچۆنێکی بێ لەماوەی کورتی دەسەلاّتیدا توانی هەر سێ ویلایەتەکەی عێراق بە دەوروبەرو ناوەندەوە ببەستێتەوە[2].

---

[1] وەرگیراوە لە: ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: شاری سلێمانی، ل ل٥٥-٥٦.

[2] وەرگیراوە لە: عەلی مەحمود محەمەد: کەرکوك شاری قەلاّو ئاگرو خوێن، گۆڤاری نەوشەفەق، ل ١٣.

لە (٢٠ی ئەیلولی ١٨٦٩)دا (وەزارەتی عالی- وەزارەتی بالاّ) نەخشەیەکی نوێی لە بواری گەشەدان بە خوێندن کێشا کەلەلایەن یاسای مەعاریفی گشتییەوە دەرچوو بە ناوی (معاریف عمومیە نظامنامەسی)، کە هەوڵیدا گەشەیەکی گەورە بدا بە، مەدەنیکردنی تەواوی خوێندنی فەرمی تایبەت لەلایەن دەوڵەتەوە[1].

بارودۆخی خوێندن لەویلایەتی موسڵدا بەشێوەیەکی گشتی تاکۆتایی سەدەی نۆزدەش لەخراپیدا بوو، بەجۆرێکی وەها تاوەکو ساڵی (١٨٨٨ز) تەنها حەوت خوێندنگا لەم ویلایەتەدا بووە، ئەوانیش لەشارەکانی: موسڵ، کەرکوک، هەولێر، کفری، ئاکرێ، رەواندوزوسلێمانی، ژمارەی خوێندکارەکانیش تا ئەو ساڵە (٣١٨) خوێندکار بووە.[2]

لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا کەرکوک وناوچەکانی دەوروبەری رۆشنبیرییەکی ئاینی کوێرانەی بەسەردا سەپابوو، لەسەر بنەڕەتی ئاینیو مەزهەبی دامەزرابوو بۆ ئەوەی هەوڵ بدرێت زانستو پەروەردەی نوێی هاوچەرخ وەربگرێت، هەرچینو(طائفە)یەك لەدەوڵەتی عوسمانیدا لەسەر ڕێبازی تایبەتی خۆی باری زانستو رۆشنبیریو پەروەردەی بەڕێوە

---

(١) د. ابراهيم خليل احمد: تطور التعليم الوطني في العراق (١٨٦٩ - ١٩٣٢)، منشورات مركز دراسات الخليج العربي بجامعة بصرة، طبعة الاولى، بصرة -١٩٨٢، ص ٣٢.

(٢) د.حسن الضيقە:الدولة العثمانية، ص٥٥.

بـردووه. ئەمــەش زیــاتر مــەودای دەوڵــەتی عوسمــانی دەدا بـۆ سەپاندنی سیاسەتی(فرق التسد) بۆیە لەو سەردەمەدا لەشارێکی وەکو کەرکوکدا، مزگەوتەکان زیاتر وەکو ناوەندێکی پەروەردەو فێرکردن رۆڵیان بینیوەو شوێنی بلاوکردنەوەی رۆشنبیری بووە. ئەگـەر قوتابخانەیـەکیش بکرایەتـەوە زیـاتر بـەتواناو بـاربووی خەڵکەکە دەکرایەوە، بۆیە هەرکاتێك باربوو برایە ئەوا کاروباری خوێندنیش لەوقوتابخانەیە لەکاردەکەوت و دەوەستا.[1]

بــەڵام لەســاڵانی هــەفتاکانی ســەدەی نـۆزدەوە دەوڵــەت هەسـتاوە بەکردنـەوەی ژمارەیـەك خوێنـدنگا، لـە کەرکوکیـشدا خوێندنگـەی پیشەیی گشتییان لەساڵی (١٨٧١ز) کردووەتـەوە. پاش خوێندنگای سوڵتانیە بەسێ ساڵ پێش بەغداو کردنەوەی خوێندنگاکانی روشدییەی ناوەندی لەکەرکوك، کفری و هەولێر، زمـانی خوێنــدن تــورکی بــووەو ژمارەیــەك کــاتی تایبــەتی بـۆ خوێنـدنی زمـانی تـورکی هەفتانـە تـەرخان کـراوە، کـە زۆرجـار چووەتە (٢٢سەعات) لە هەفتەیەکدا، سەبارەت بەزمانی کوردیش هیچ بوارێکی وەهای نەبووە شایەنی باس بێت تەنها یەك کات نەبێت لە هەفتەیەکدا، زمانی عەرەبیش لەزانستەکانی پەیوەست بەشــەریعەتدا دەخــوێنرا.[2] لەســاڵی (١٨٧٠ز) قوتابخانــەی روشدییە لەناو شاردا کرایەوە، بەڵام ئەم قوتابخانەیە لەساڵی

---

[1] مجموعة من الأكادميين العراقيين: كركوك مدينة القوميات المتآخية، ص ١٥٥.

[2] د.عمر ابراهيم توفيق: التركمان في العراق. ص١٦٠.

(١٨٩٥ن) كرا بەقوتابخانەیەكی ئامادەیی و نموونەی هەمان قوتابخانەش لەشاری سلێمانی كرایەوە. لەساڵی (١٨٩٨ن) دەست كرا بەكردنەوەی ژمارەیەك قوتابخانەی دیكە، كە ژمارەیان سێ قوتابخانەبوو، لەگەڕەكەكانی(قۆریە)و(قەڵا)و(كۆپری باشی). هەرلەم قۆناغەدا زمانی توركی كرابووە دەسكەلای كارە بەڕێوەبەری و كارگێڕییەكانی ناوچەی كەركوك، لەم كاتەدا دووبارە، بارە رۆشنبیرییەكە كرابووە قوربانی گۆڕانكارییە سەربازییەكان،[1] ئەگەر سەیری بارودۆخی فەرهەنگی رۆشنبیری شاری كەركوك لەوماوەیەدا بكەین، وای لێهاتبوو كەبارێكی خراپی بەسەردا بێت و هەموو رۆشنبیرییەكیش كەوتبووە بۆتەی رۆشنبیری توركی و ئاینییەوە. بۆیە ئەوچاپەمەنی و نوسراوانەی لەو سەردەمەدا دەردەچوون لەباری رۆشنبیری توركی پەلیان نەدەهاویشت و لەدەربڕینی ئەو رۆشنبیرییەو زمانەكەیدا دەسوڕانەوە.* [1]

[1] وەرگیراوە لە :سمكۆ بەهرۆز: مێژووی زمانەوانی و گۆڕانە رۆشنبیرییەكانی ناوچەی كەركوك، گۆڤاری كەركوك، ژمارە(١)ی ساڵی پێنجەم، هاوینی ٢٠٠٣، ل ١٦٠.

* عوسمانییەكان لەماوەی فەرمانڕەوایەتیان لەبەشی باشوری كوردستان، توانیان زمانی توركی لەنێو هەندێك لەبەشەكانی هەردو مەڵبەندی شاری كەركوك و هەولێر بڵاوبكەنەوە. چونكە دەوڵەتی عوسمانی ئەوەندەی بەپەرۆشەوە بوو بۆ سەپاندن و بڵاوبوونەوەی زمانی توركی لەنێوخەڵكیدا ئەوەندە مەبەستی بڵاوبوونەوەی خوێندەواری نەبوو، لەناوچەكانی دیكەدا خەڵكی زۆر بەسستی بۆكاری موچە خۆری و سەربازی فێری نەبوون. بەڵام-

سیستەمی پەروەردەو فێرکردنیش لە ویلایەتی موسڵی عوسمانیدا بە دوو شێوە بووە:

یەکەم: ئەو قوتابخانانەی سەر بە وەزارەتی مەعاریف بوون.

دووەم: ئەو قوتابخانانەی سەر بە دائیرەکانی ئەوقاف بوون کە قوتابخانە یان مەدرەسە ئاینییەکان و حوجرەکانیان دەگرتەوە ئەو قوتابخانانەی سەر بە وەزارەتی مەعارف بوون لە قوتابخانەکانی (صنایع)و قوتابخانە سەرەتاییەکان پێکهاتبوون، بەپێی زانیارییەکانی (مس بێل)یش لە ساڵی (١٩٠٧ن)دا لەسەرتاسەری ویلایەتی موسڵدا لەگەڵ ئەوەی هیچ قوتابخانەیەک نەبوو بۆ کچان بە گشتی و قوتابخانەکانی دیکەش بەم شێوەیە بوون:

---

-کەرکوک‌و دەوروبەری چونکە هەر لەزووەوە لەژێر دەستی قەرەقۆینلوو تورکمانان بوون، ناوی تورکیان وەرگرت و ناسنامەی تورکمانیان بۆخۆیان پاراست، بەم شێوەیە دووشێوە زمانی تورکمانی و تورکی-مەغۆلی ئازەربایجانی لەممەندێ لەشارۆچکەکانی کوردستان جێگیربوو، ئەوانەشی بەتورکمانی قسە دەکەن زۆربەیان کۆنە کورد یان پاشماوەی سەربازو موچە خۆرەکانی دەوڵەتی عوسمانین. بەڵام ئەوانەی بەتورکی مەغۆلی و(جغەتایی)و ئازەربایجانی قسەدەکەن، هەموویان پاشماوەی سەلجوقی ئازەربایجانین و خەڵکانی دەرەوەی کەرکوکن و(شیعە) ن، بەڵام ئەوانەی کەرکوک زۆرینەیان سونین(م.جەمیل رۆژبەیانی: مێژووی تورکمان و تورك لەکوردستانی خوارو. گۆڤاری کەرکوک ژمارە((٢٥))هاوینی-٢٠٠٥. ل١٣.

[1] سمکۆ بەهرۆز: مێژووی زمانەوانی و گۆرانە رۆشنبیرییەکانی ناوچەی کەرکوک. ل١٣٩-١٤١

لـه کـەرکوك: يـەك مەکتـەب (قوتابخانـە)ی روشـدييە، يـەك قوتابخانەی سەرەتايی و يازدە حوجرە هەبووە.

لـە سليّمانی: يەك خويّندنگەی روشـدييەی سـەربازی، يـەك خويّندنگـەی روشـدييەی مـولکی، يەك خويّندنگـەی سـەرەتايی و دوو حوجرەی مندالان هەبووە.

لـە قـەزای رەوانـدوز: يـەك خويّندنگـەی روشـدييەو دوو حـوجرەی منـدالان هـەبووە. لـەکاتی بەريّوەبـەريّتی (محەمـەد عـەونوللا ئـەلکازمی) موتەسـەريفی ليـوای کـەرکوك (١٩١٠ – ١٩١٣) لـە شـاری کـەرکوك قوتابخانەيـەکی پيشەسازی بـەناوی (مەکتـەبی صـنايعی سـولتان)يـەوە دروسـت کـرا. مەکتـەبی سـولتانيە هـەمان مەکتـەبی روشـدييەيە بـەلام ناوەکـەی لـەپيّش جـەنگی يەکـەمی جيهانيـدا گـۆڕدراوە. هـەر لـە هـەمان بينـادا ماوەتەوە، کە دەکەويّتە کەناری روباری خاسەوە، بە بەری سەرا، دەرگای دەرەوەی مەکتەبەکە دەيڕوانيە ئەو شەقامەی، کە بـەهۆی پردە کۆنەکەوە دەچووە ناو قەلا[1].

دەربـارەی قوتابخانـەو خويّنـدنگا مەسـيحيّکانيش لەشـاری کەرکوك لەم قۆناغەدا زياتر لەناو کليّسەکاندا بووە، بريتـی بووە، لـەفيّربوونی نوسـين و خويّندنـەوەو پاشـان ئـاينی مەسـيحی و

[1] راپۆرتی کارگيّڕی دەڤەری کەرکوك (ماوەی ١ی کانونی دووەم ٣١ی کانونی دووەمی ١٩١٩)، وەرگيّڕانی لە ئينگليزييەوە: سەربەست کـەرکوکی، چاپخانەی شڤان، سليّمانی، ٢٠٠٦، ل ٨٨.

لاهوت* و زانیارییە ئاینیەکان دەخوێندران، قوتابخانەکانیش کە دەکرایەوە لەسەر یارمەتی خەڵکەکە بووە، یەکێك لەو قوتابخانانەی شاری کەرکوك، قوتابخانەی (کلدانی کاسۆلیك) بووە کە لەساڵی (١٨٥٠ن)کراوەتەوە. هەروەها کردنەوەی قوتابخانەی تێکەڵاوی سەرەتاییش، لەگەڵ ئەوانەش کردنەوەی قوتابخانەی سەرەتایی لەلایەن نێردراوی دۆمەنیکانەوە** لەساڵی (١٨٦٧ن).[1]

هەر لەم روانگەیەوە رەنگە مژدە بەرەکان زەمینەیەکی لەبارتریان بۆ چالاکیەکانیان لەکوردستانی ناوەندو بەشێکی

---

* لاهوت:-زاراوەیەکە نەهلی کەلامو فەیلەسوفەکان لەجیاتی زانستی عەقیدەو یەکتاپەرستی بەکاریان هێناوە، لەزانکۆکانی رۆژئاوا چەند بەشێکی هەیەو ناسراوە بە(الدراسات اللاهوتیە).(شێخ ندیم الجسر: داستانی ئیمان لەنێوان فەلسەفو زانستو قورئان، و. نوری عەبدوڵا ساڵح/ چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر-٢٠٠٣، ل ١٠١-١٠٢).

** لەگەڵ گەشتەکانی مژدەبەرە رۆژئاواییەکان بۆ گوندەکانی ناوچەی گەرمیان و کەرکوك لەناوەندی سەدەی نۆزدەدا، چەند قوتابخانەیەکیان کردۆتەوەو دەزگای چاپیشیان هێناوە مەبەستیشیان گەیاندنی مەعریفەو بلاوکردنەوەی ئاینی مەسیحی بووە هەتا کۆتایی سەدەی نۆزدە توانیان چەند ئەزمونێکی وەکو چاپکردنی چەند کتێب لەوانەش ئینجیل بەهەردوو جۆرەکەی کۆن و نوێ و بەزمانی ئاشوری و بەدەست بهێنن.( W.W.W.assyrians Of Kirkuk. Com/ School history. P1)

[1] سمکۆ بەهرۆز: مێژووی زمانەوانی و گۆرانە رۆشنبیرییەکانی، ل ٣٢.

کوردستانی باشور دۆزیبێتەوە، چونکە ئەو شوێنانە شانشینە دێرینە مەسیحییە کورەکەی ئادیابین و(کارخوبت سالوخی) لەکەرکوک تێدا هەڵکەوتووە پێدەچێ ئەم هەلە بۆ مژدە بەرەکان لە کوردستانی باکورو رۆژئاوا لەئارادا نەبووبێت، لەکاتێکدا خەڵکەکەی پەیوەندییان لەگەڵ ئاینی مەسیحیدا زۆرنەبووە. هەر ئەم بارە وای لەرۆمە بیزەنتیەکان کردووە لە سەدەکانی پێشتردا رایانکوێزن.[1]

بەڵام دەربارەی جولەکەکانی کەرکوک لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا قوتابخانەو خوێندنگای خۆیان هەبووە، ئەویش قوتابخانەی کەرکوک بووە، ئەم قوتابخانەیە لە قوتابخانەکانی موسڵ کۆنتر بووە، لە ساڵی (١٩٠٣ز) ژمارەی قوتابیەکانی گەیشتووەتە(٦٠قوتابی).[2]

لەخوێندنگای جولەکەکانیشدا گرنگی بەخوێندنە ئاینییەکان دراوەو نیوەی کاتەکانی هەفتە بۆ ئەو مەبەستە دابین کراوە، ئەوانیش وەك خوێندنی تەورات و (تەلمود*)و کۆمەڵێك

---

[1] میهرداد ئیزدی: ئاین و تایفە ئاینیەکان لەکوردستان، وەرگێڕانی لەئینگلیزییەوە کامەران فەهمی، چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠٠٢، ل ٩٤.

[2] سمکۆ بەهرۆز: مێژووی زمانەوانی و گۆڕانە رۆشنبیرییەکان، ل ٤٢.

* تەلمود:- گرنگترین کتێبی پیرۆزی جولەکەیە لەپاش تەورات، لەدووبەش پێك دێت(مشناو غەمارا)، مشنا داب و نەریتی سەرزارەکیەو غەماراش تەفسیری مشنایە تەلمود دوو غەمارای لێکجیاوازی هەیە، یەکێکیان تەلمودی فەلەستینییە، کە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی چوارەم و دووەمیان

بەندی هەڵبژێردراو لەدیوانی شعرییەکان بەزمانی عیبری بەدەر لەوانەش لەوەرزی پشودا دەستەی خوێندنگا یەهودیکان لەعێراقدا خوێندکاری گروپەکانی خۆیان بۆ گەشت و خوێندن و خولی فێربوونی زمانی فەرەنسی هەڵدەبژارد.[1] لەگەڵ ئەوەی کەمینە مەسیحی و جولەکەکان دامەزراوەی فێرکاری ئاینییان هەبوو، بەڵام بە بەراورد لەگەڵ خوێندنگای موسوڵمانەکاندا پێشکەوتووتر بوون[2].

عوسمانییەکان لە ساڵی (١٥٦٥ز)دا بۆ یەکەمجار ئاشنایەتیان لەگەڵ چاپخانەدا پەیدا کردووەو سەرەتاش لێی کەوتوونەتە سەنگەرەوەو چەندین بیانوویان بۆ ڕێگەگرتن لە بڵاوبوونەوەی چاپخانە هێناوەتەوەو ئەم پرۆسەیە لەلای گەلە موسوڵمانەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانی زۆر لەوە پتر دوا کەوت. لەسەردەمی نوێداو بۆ یەکەمجار لە ساڵی (١٨٣٠ز)دا یەکەم چاپخانە بەناوی چاپخانەی (دارالسلام) لەلایەن (میرزا باقر التفلیسی)یەوە دامەزرێنرا، کە بە ڕەگەز تورک و بە ناسنامەش ئێرانی بووە. دووەمیش یەکێک لە گەورە پیاوانی فارس لە کەربەلاو سێیەم چاپخانەش لەلایەن نێردراوی دۆمەنیکان لە

---

تەلمودی بابلییە، کە دەگەڕێتەوە بۆسەدەی شەشەمی پ.ز.(میهرداد ئێزدی: ئاین و تایفە ئاینییەکان لەکوردستان، ل ٥-٦.)

[1] د. فاضل براك: المدارس اليهوديه والايرانيه في العراق، طبعة الثانيه، بغداد، ١٩٨٥، ص ٢٧-٢٨.

[2] د. ابراهيم خليل احمد: تطور تعليم الوطني في العراق (١٨٦٩ ١٩٣٢)، ص ٢٧.

موسڵو چوارەمیش لەلایەن (میرزا عەباس) لە بەغداو پێنجەمیش لەلایــەن پیــاوێکی ئــاینی ســەر بــە کلدانییــەکان دامــەزرێنرا، (مەدحەد پاشا)یش لە سالی (١٨٦٩ز)دا بیری لە دامەزراندنی چاپخانە کردەوە،بەڵام لە ئاکامی خراپی دەسەڵاتی عوسمانی لە نێوان ساڵانی (١٨٦٩-١٩١٨ز) کورد نەیتوانیوە هیچ سوودێکی بەرچاو لەو چاپخانانە وەربگرێتو لێیان بێبەش بووە[١].

چــاپو چــاپخانەش کــە بەشــێکە لەرەوشــی فەرهــەنگی ئەوکاتــەی شــاری کــەرکوك، یــەکێك لــەو چــاپخانە کۆنانــە کــە لــە کوردســتاندا پەیــدا بــووە، چــاپخانەی ویلایــەت(الولایــە)بــووە، لەساڵی (١٨٨١ز) لەلایەن(فەیزوڵا پاشای کوڕی حسین پاشا)وە، لەشاری کەرکوك دامەزرا، فەیزوڵا پاشا هەرچۆنێك بوویێت بۆ راپەڕانــدنی کاروبــاری ئیــداری هەرێمەکــە، یــان بۆخزمــەتی کاروبــاری رۆشــنبیریو هونــەری ئــەو چــاپخانەیەی لەشــاری ئەســتەمبوڵەوە کڕیــوەو لەڕێگــەی دەریــاوە بەکەشــتی رەوانــەی کردووەو پاشان لەڕێگەی وشکانییەوە بۆ کەرکوکی هێناوە.[٢]

---

[١] وەرگیراوە لە: غازی حەسەن: یەکەم چاپخانەی کوردستان لە کەرکوك بــووە، گۆڤــاری نەوشــەفەق (گۆڤــارێکی مانگانــەی رۆشــنبیرییە- -دەزگــای شەفەقی رۆشنبیری لە کەرکوك دەریدەکات)، ژمارە (١١)ی شوباتی ٢٠٠٤، ل ٧.

[٢] سمکۆ بەهرۆز: مێژووی زمانەوانیو گۆڕانە رۆشنبیرییەکانی. ل ١٤٥.

شاعیری کوردیش(صافی)[*] سالّی (١٢٩٦ك-١٨٨٠ز) بەسالّی دامەزراندنی ئەم چاپخانەیە دادەنێت و لەپارچە شعرێکدا دەلّێت:

اشبو تاریخ اوقنور کوردم مقام اوجده
هر طرف جوهرلو بدصورت ایله سنطور اوستنه
شهرزوری موصل حدبایه الحاق ایتدیلر
باق ایشه کم قویدلر قنبوری قنبور ئەوستە

لەشوێنێکی تردا دەلّێت:

حضرت فیضی او پاشای جلیل المنقبه
والی عالی او دستور معارف اجتهاد
شهیر جبریلندن تحریر مدحنده قلم

---

* عبدالله صافي كركوكي: شاعیرێکی بەناوبانگی کەرکوکە لە سالّی (١٢٠٤ك) لەدایك بووە، شیعرەکانی لەنێو شاعیرانی بەغداو موسلّ و کەرکوك بلاّوبۆتەوە. لە ژیانیدا سەردانی ئەستەمبولّی کردووەو نوسراوێکی بەناوبانگی هەیە بەناوی (ئیفترانامە). شیعرەکانی زیاتر مێژوویی و واقعی بوون و پەیوەندیان بە ڕەوشی عێراق و زۆر کەسایەتی ئەوکاتەی عێراقەوە هەبووە، ئەمە جگە لە گرنگیدانی ئەو بە غەزەلیات. بەلاّم بەشێوەیەکی تایبەت شیعرەکانی ئەو لە ڕوی مێژووییەوە گرنگی تایبەتیان هەیە. باوکی (بەهجەتی پۆلیس)ە کە ئەمیش کەسێکی ناودارو پۆلیس بووە لەگەلّ ئەوەشدا لە کەرکوکدا شاعیر بووە، صافی شاعیر لە سالّی (١٣١٦ك) کۆچی دوایی کردووە.(محمد علی قرداغی: هویە كركوك الثقافية والادارية، دار اراس للطباعة والنشر، طبعة الاولى، اربیل ٢٠٠٤، ص ٩٢-٩٣).

اولسه شاياندر سواد زلف حوراندن مداد
بندەسی صافی تشکر له دیدی تاریخنی
مطبعة بوييلده شهرزور ده اولدی کشاد [1]

هــەر لــەبارەی ئــەم چـاپخانەیەوە (بهنــام فـضیل عفــاس) ئامــاژەی کــردووەو نوســیویٚتی، کــە ئامــانج لــە دانــانی ئــەم چاپخانەیە چاپکردنی رۆژنامـەی فـەرمی بووە. هـەروەها هەندێك کتێبی لـیٚ چاپکراوەو بە زمانی تورکی بـووە، بـەلاٚم لێرەدا ئـەم راسـتیانە دەریـدەخات کـە ئەمـە یەکـەم چـاپخانە بـووە، بـۆ کوردسـتان هێنـراوەو کـاری ئیـداری لـە شـاری کەرکوکـدا پـیٚ راپەڕێنـدراوەو لەگـەلٚ ئەوەشـدا چـەند کتێبێکـی پـیٚ چاپکراوە. بەلاٚم هـیچ یـەکێك لـەو کتێبانـە بـە زمـانی کوردی نـەبووە، چونکە زمـانی فەرمانڕەوایـەتی و ئیـداریو خوێنـدن لەوکاتـەدا زمـانی تورکی بووە[2].

دواتر چاپخانەی ویلایـەت بەفـەرمانی(تەحسین پاشا)ی والی ویلایــەتی موســلٚ گواســترایەوە بــۆ شــاری موســلٚ، لــەوە بـەدواوە(محمـد عـون اللـه الكاضـمي) چـاپخانەیەكی تایبـەتی بـەناوی(الـصنايع) تێـدا دامەزرانـد[3] محمـد عـون اللـه اكـاظمـي

---

[1] عطا ترزی باشی: کرکوك مطبوعات تاریخی، قسم-١، کرکوك، ٢٠٠١، ل٢١-٢٣-٢٤.

(٢) وەرگیراوە لە غازی حەسەن: یەکەم چاپخانەی کوردستان لە کەرکوك بووە، ل٨.

[3] وەرگـیراوە لـە رەفیـق سـالح: رۆژنامـەوانی کـوردی لەکـەرکوك، گۆڤـاری هەزار مێرد، ژمارە(١٦)، حوزەیرانی٢٠٠١، ل٧.

کەزانایـــەکی ئــاینی بـــوو، کرایـــە موتەســـەریفی کـــەرکوک. لەســـاڵی(١٣٢٦ ڕۆمـــی) لەلایـــەن ســـوڵتان عەبدولحەمیـــدەوە لەکـــەرکوک دەســـتی کـــرد بەکردنـــەوەی قوتابخانـــەی(صـــنایعی سـوڵتانی)، لەگـەڵ قوتابخانەکەشـدا چاپخانەیەکی تایبـەتی بـۆ تـەرخان کـرد کـە بەڕێوەبـەری قوتابخانەکـە لەسـەر ڕەزامەنـدی موتەسەریفی کەرکوک بە (١٥٠٠لیرە)ی عوسمـانی لـە ئەستەمبوڵ کڕیبووی، ئـەم چاپخانەیە ڕۆڵێکـی گرنگـی هـەبوو لەچاپکردنی چەند کتێب و ڕۆژنامەو گۆڤارێك.[1]

ســـەبارەت بەچـاپکراوەکانیش بەشـێوەیەکی گـشتی لـەو قۆناغـەدا دەقـاو دەق بـەپێی فەرمانـەکانی سـوڵتان ژمارەیـەکی دیـاریکراو لەهـەر چاپەمەنیەك دەردەكـراو بـەزۆریش لەسـنوری ئەستەمبوڵی پایتەختدا بڵاو دەکرانەوە. بەڵام لەساڵی (١٨٨٥ز) بـەدواوە لەشـارو ناوچـەکانی دیکەشـدا بەیاننامـەو فـەرمان و بانگـــەوازە فەرمییـــەکان بـــەژمارەی (١٠٠-١٥٠) دانەیـــەك بڵاودەکرانـــەوە، زۆربـــەی زۆری ئەمانـــەش هـــەر فەرمانـــەکانی سوڵتان و بڕیارە ڕەسمـی و دادگاییەکان یـان فەرمانی سوپایی و هەواڵی ئیداری ناوچەکان بوون.[2]

لەدوای کودەتای (٢٣ی تەموزی ١٩٠٨ز) کۆمەڵـەی ئیتحـادو تـەرەقی پرۆگرامـی سیاسـی خۆیـان لـە کۆتـایی مـانگی ئـەیلولی

---

[1] سمکۆ بەهرۆز: مێژووی زمانەوانی و گۆڕانە ڕۆشنبیرێکانی، ل١٤٦.

[2] جەلیلی جەلیل: هەندێ سیمای ژیانی کۆمەلایـەتی و سیاسـی و کلتوری کورد، وەرگێڕانی: ئەنوەر قادر محمد، ستۆکۆڵم- ١٩٩٣، ل ١٢.

(١٩٠٩) دا بلاوکـرنەوە، ئـەوەی پەیوەنـدی هـەبوو بـە بـواری پەرەوەردەو فێرکردنـەوە لـەو پرۆگرامـەدا هـاتبوو. کە (پێویستە لەسەر دەولەت سیستەمێکی فێرکاری و پـەروەردەیی یـەککرتووی عوسمـانی بگرێتەبـەر. کۆبوونـەوەی سـەرجەم پێکهاتـەکانی دەولـەت، لـە پرۆسـەو سیـستەمێکی فێرکـاری هاوبەشـدا کـە پەیوەست بێ بەو پەروەردە یەککرتووەوە). پاشتر کۆمەلە هەستا بە کردنەوەی ژمارەیەك لە قوتابخانە سەرەتایی و ڕوشدیەکان و پرۆسـەی فێرکـاری کـچان، تـا ڕادەیـەك گەشـەی بـەخۆوە بینی، کردنـەوەی قوتابخانـەی سـەرەتایی لـە ژمارەیـەك لـە ناوچـەکانی بەغدا: عنە، سەماوە، کازمیە، خانـەقین، نەجـەف، کەربـەلا، حلە، دیوانیە هەر لەم سەردەمەیشدا مەسـەلەی چاودێری پـەروەردەیی (الاشراف التربوي) گرنگی پێ درا. نمونەی ئەوانەش کە بوون بە چاودێرو سەرپەرشتیاری مـەعاریفی موسلْ (ئیبراهیم ئەفەندی) بوو. (شاکر بەگ) بوو بە چاودێرو سەرپەرشتیاری مـەعاریفی بەغـدا (عەبدولکـەریم ئەفەنـدی) چـاودێرو یاریـدەدەر بـوو. بـۆ کاروبـاری قوتابخانـە سـەرەتاییەکان وە ژمارەیـەك لـە کەسـایەتی عێراقی دانران لە (ئەنجومـەنی نوێنـەران)، بۆ کاروبـاری فێرکـاری لـە (ای ئازاری ١٩٠٩)شـدا نـائیبی کـەرکوك بیر خەرەوەیـەکی بۆ سەرۆکی ئەنجومەن بەرز کردەوەو لـەو بیرخەرەوەیـەدا ئـاماژەی کردبوو بە:

١- دواکەوتوویی خوێندن لە شاری کەرکوکدا.

٢-ئەو خوێندنگایانـەی کە ئێستا لـە کـەرکوك بونیـان هەیـە بچوکن و ناتوانن ژمارەیەکی باش خوێندکار لە خۆیان بگرن.

٣-هەر لەو بیرخەرەوەیەدا نائیبی کەرکوك داوای کردنەوەی قوتابخانەی دواناوەندی، ڕوشدیەی سەرەتایی نوێی کردبوو[١].

بەمجۆرە لێرەدا ئەوە بەدەر دەکەوێت کە بارودۆخی رۆشنبیری و شارستانی لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا وای لێهاتووە کەبارێکی تاریکی بە سەردابێت و سەرجەم رۆشنبیرییەکان بوونەتە قوربانی رۆشنبیری تورکی و ئاینی. لەنێوان سالآنی (١٦٣٨ز-١٩١٧ز)، لەماوەی حوکمڕانی عوسمانییەکانە لەعێراقی ئێستادا، پەروەردە بەمەبەستی گەشەکردنی باری رۆشنبیری نەبووە، بەڵکو زیاتر بۆ پێناوی گەشەی سەربازی بووە.[٢] لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کاریگەری بارە رۆشنبیرییەکە بەشێوازێك بووە، کاردانەوەی تەواوی لەسەر خوێنکاران هەبووە، بەشێوەیەك هەندێ لەخێزانە کوردەکان وەك خێزانی(یەعقوب زادە) کە دەگەڕێنەوە سەر عەشیرەتی زەنگەنەو ئەوانەیان لەکەرکوك نیشتەجێ بوون ناسنامەی خۆیان گۆڕیوە بەتورکی چونکە پارەو دەسەڵاتیان پێ دراوە. بەڵام ئەو بەشەی ئەم خێزانە کە لەهەولێر نیشتەجێ بوون، ناسنامەی رەسەنی خۆیان پاراست.[٣]

---

[١] د. ابراهيم خليل احمد: تطور التعليم الوطني في العراق (١٨٦٩ - ١٩٣٢)، ص ٤٧-٤٨-٥٠.

[٢] محمد هادی دفتر عبدالله حسن: العراق الشمالی، ص ٥٥.

[٣] د.کمال مظهر احمد: کرکوك وتوابعها، ص ٨٩.

ئەوەی بەشێوەیەکی گشتی سەرنج دەدرێت لەبارودۆخی پەروەردەوفێرکردن و رۆشنبیری ناوچەی کەرکوك لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا بەم شێوەیەی لای خوارەوە بووە:

یەکەم/زۆربەی ئەو قوتابخانانەی کە دروست کراون لەسەرکۆمەکی خەڵکی ناوچەکە بووە، بۆیە هەرکاتێك پارەو یارمەتی نەماوە، قوتابخانەکەش لەکارو ئیشەکەی وەستاوە نمونەی ئەمەش(مکتب الضائع) باشترین بەڵگەیە.

دووەم/زۆرینەی قوتابخانەکان شەقڵێکی سەربازیان هەبووە، زیاتر بۆ جێبەجێکردنی مەرامە سەربازییەکان بونیاد نراوە.

سێیەم/ ئەوەی لەباری رۆشنبیری ئەو سەردەمەی کەرکوکدا بەرچاو دەکەوێت، لەگەڵ پێداویستی گۆڕانکارییەکانی سەردەمدا نەبووە.

چوارەم/زمانی خوێندن لەو قوتابخانەدا زیاتر زمانی تورکی بووە بە پلەی یەکەم و هەوڵدان بوو بۆ سڕینەوەی زمانی نەتەوەکانی دیکەی نیشتەجێی ناوشاری کەرکوك.

پێنجەم/هەوڵدان بۆ بلاوکردنەوەی رۆشنبیری تورانچێتی، ئەمەش زۆربەزەقی لەسەردەمی گرتنەدەستی دەسەلآت لەلایەن کۆمەڵەی(ئیتحادو تەرەقی)یەوە دەردەکەوێت، لەکاتێکدا هەموو شتەکانیان دەگەڕاندەوە سەر چاوگەی تورانچێتی، دور لە واقیعی نەتەوەکانی تر.

شەشـــەم/بڵاوبوونـــەوەی فێرکردنـــی ئـــاینی لەسوچـــی مزگەوتـەکان، کـە شـوێنێکی گـرنگ بـووە لەخزمـەتی ڕۆشـنبیری لەماوەی فەرمانڕەوایەتی عوسمانییەکاندا.[1]

---

[1] ئـەم هەڵسەنگاندنە وەرگیـراوە لـە سمکۆ بـەهرۆز: مێـژووی زمانـەوانیو گۆڕانە ڕۆشنبیرییەکانی ناوچەی کەرکوک، ل ١٤٢-١٤٣.

# باسی دووەم

## ڕەوشی ئابوری شاری کەرکوک

لەبەر ئەوەی کوردستان لەلایەن هەردو دەوڵەتی ئێرانی و عوسمانی داگیر کرابوو، هەردووکیشیان لەڕووی ئابوری و کۆمەڵایەتی و ئیدارییەوە دواکەوتوو بوون بۆیە هیچ کارێکی ئەوتۆیان بۆ گۆڕان و پێشکەوتنی ئابوری لەکوردستاندا نەکرد. کشتوکاڵ شادەماری ئابوری کوردستان بوو، پاش ئەوەش بەخێوکردنی مەڕومالآت و بازرگانی دەهات.[1]

[1] د.عەبدوڵا عەلیاوەیی: کوردستان لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا، ل٢٩.

جەنگی رووسیاو دەوڵەتی عوسمانیش (١٨٧٧-١٨٧٨ن) کەلێنی گەورەی کردبووە نێو حامیەکانی عێراق و بڵاوبوونەوەی زیاترو زۆربوونی هەژاری لەنێو کۆمەڵانی خەڵکیدا.[١]

بارودۆخی ئابوری کوردستان بەشێوەیەکی گشتی لەم کاتەدا زیاتر پشتی بە بەروبومە کشتوکاڵیەکان دەبەست، کشتوکاڵیش لەلایەن رژێمی دەرەبەگایەتی و هۆزایەتییەوە بەڕێوە دەچوو، هەربۆیە دەرەبەگەکان لەسەر بنەمای بەرژەوەندی خۆیان بێ ئاوڕدانەوە لەجوتیارانی کورد دەستیان بەسەر زەوی و داهاتی کشتوکاڵی و سەرچاوە ئاوییەکانی ناوچەکەدا گرتبوو.[٢] پەیوەندی دەرەبەگایەتیش زیاتر ببووە هۆی ئەوەی کۆسپێکی گەورە بێت لەڕێگای گەشەکردنی دۆخی ئابوری وڵاتدا.[٣] لەلایەکی دیکەوە یەکێکی تر لەفاکتەرە سەرەکییەکانی گەشەنەکردن و بەرەو پێش نەچوونی کشتوکاڵ لەکوردستاندا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو باجە زۆرانەی کە خێزانە جوتیارەکانی بەهیلاك بردبوو.[٤] هەر لەو میانەدا داهاتی دەوڵەتی عوسمانی ساڵی (١٨٨٨ن) لەسەنجەقی کەرکوك (٧,٥ملیۆن) قرش* بووە،

[١] س.هـ. لونگريك: اربعة القرون من التأريخ العراق الحديث، ص ٣٢٨.

[٢] کەیوان ئازاد ئەنوەر: چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی نوێ وهاوچەرخی گەل کورد، ل ٤٧.

[٣] د.جەلیلی جەلیل: کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، ل٦١.

[٤] کامران عبدالصمد احمد دوستکی: کوردستان العثمانیه، ص٣١.

* سکەکانی دەوڵەتی عوسمانی بەم جۆرە بوون:( لیرەفئە-١٠٠٠قرش)، (المجیدی فئە-٢٠قرش)،(قرش وچارەکە قرش)، لەکوردستاندا مامەڵەکردن

ئەم داهاتەش لەباجی زەوی‌و باجی موڵك‌و مەڕومالاٌت‌و بەدەل سەربازی‌و باجەكانی ناوخۆو باجی دەیەك‌و باخ‌و باخاتەكان‌و تاپۆو روسمات كۆكراوەتەوە[1]. كەركوك لەسەرە ڕێی چەند كاروانێكدایەو ئەو شارەش خانی بەیەك گەیشتنەوەی كاروانەكانە، بۆیە كاری بازرگانی تیادا پەرەی سەندووە.[2] بەلاٌم زۆرجار هەمەوەندییەكان ڕێگای سلێمانی- كەركوكیان بڕیوەو كاروانە بازرگانیە كانیان تالاٌن كردووە، بۆیە دەوڵەتی عوسمانی گرنگییەكی زۆری بە بنەماڵەی شێخان داوە، تاوەكو بەهاوكاری ئەوان بتوانێ بەسەر هەمەوەندییەكاندا زاڵبێت، زۆرجاریش بنەماڵەی(شێخ سەعید)* خۆیان باجێكی زۆریان خستۆتە سەر كالاٌ بازرگانیەكان‌و هێندەی تر بازاڕەكانیان لاواز كردووە.[3]

---

بەسكە(پارە)ی عوسمانیەوە لەسنورێكی تەسكدابووە. تاوەكو نیوەی یەكەمی سەدەی نۆزدە، زۆرترین مامەڵە بازرگانییەكانی نێوخۆش لەسەر شێوەی(مقایضە) بووە.(كامران عبدالصمد احمد دوسكی: كوردستان العثمانیە، ص ٤٤.)

[1] مجموعە من الاكادمین العراقین: كركوك مدینة قومیات المتاخیة، ص ١٥٥.

[2] كوردستان لەچاپكراوەكانی عوسمانیدا، وەرگێرانی فەیسەڵ دەباغ، ل١٣١.

* شێخ سەعید كوڕی شێخ محمد حاجی كاكە حمەدی شێخی كوڕی شێخ مارفی نۆدێیە باوكی شێخ محمودی مەلیكە، رەچەڵكیان دەگەڕێتەوە سەر شێخ عیسای بەرزنجی كوڕی شێخ بابا عەلی هەمەدانی.(علی كمال، مذكرات علی كمال، تقدیم و تحقیق جمال بابان، بغداد، ٢٠٠١، ص٥٧.

[3] ئاكۆ عەبدولكەریم شوانی: شاری سلێمانی، ل ٤٦.

بەپێی کتێبی(ممالك عثمانننەك تاريخ وجغرافيا لغاتی) کەنوسراوی(علی جواد)ە شاری کەرکوك لەوکاتەدا (٤٧٣٠ خانو، ١٢خان، ١١٨٣دوکانو مەغازە، ١٢٨٤باخی بچوك، ١٨٠باخی گەورە، ٢٠٥وەقفی زەوی، ٣٦مزگەوتی گەورەوبچوك، ١٨خوێندنگاو٨حەمام، ٣فڕن، ٦٤ئاش، ١قشتلەو ١٠قەرەغولخانە)ی تێدایە، پاشتر وەسفی کەرکوك دەکاتو دەڵێت"شارۆچکەی کەرکوك لەسەر تەپۆلکەیەکی ناسروشتییەو ئەم بەرزاییەش بۆئەوە بووە فەرمانڕەوایی چواردەوری خۆی بکات، زۆری ئاویشی وایکردووە کە میوەیەکی زۆری لێ بچێندرێت لە لیمۆو پرتەقاڵو..هتد خورما کە لەشوێنی گەرمدا پێدەگات بوونی لەو شارەدا هەیە. لەدەوروبەری شاردا باغو باخاتێکی زۆر هەیە هەروەها ئەم شارە بەئاوی کانزاییو نەوت بەناوبانگە، ئاوە کانزاییەکەی بۆچارەسەرکردنی نەخۆشی جۆراوجۆرو ئاوی خوێیاویشی زۆرە".[1]

لە(قاموس ئعلام)ەکەی شەمسەدین سامیدا هاتووە کەرکوك(٣٦مزگەوت)و(٧قوتابخانە)و(١٥تەکیە)،(١٢خان)،(١٢٢٨کۆگاودوکان)،(یەك قەیسەری)،(٨گەرماو)،(پردێك لەسەر رووبارەکەی)،روشدییەیەکو(١٨خوێندنگای منداڵان)،(١٣کڵێسە)،(یەك حەون) قەڵاکەی لەسەر تەپۆڵکەیەکی

---

[1] کوردستان لەچاپکراوەکانی عوسمانیدا، و فەیسەڵ دەباغ. ل١٣١.

بەرز لەلای راستی رووبارەکە دروست کراوە، گەڕەك و کۆڵانەکانی لای خوارەوەیشی هەمووی دووکان و فرۆشگان.[1]

کاتێك ئێمە سەیری ئەم ئامارانە دەکەین جۆرێك لەڕەوشی ئابوری ئەوکاتەی شاری کەرکوکمان دێتە بەرچاو کەتاڕادەیەك شارێکی ئاوەدان و گەشە کردوو بووە، بەڵام هەرجۆرە نەهامەتی یان کۆسپی گەورەی ئابوری بەسەر ئەم شارەدا هاتبێت، زۆرجار گەڕاوەتەوە بۆ بارودۆخە سیاسیی و سەربازییە نالەبارەکەی دەوڵەتی عوسمانی.

سەبارەت بەبارودۆخی کشتوکاڵ لەم شارەدا، بەهۆی بارودۆخی ئاووهەواوە ژمارەیەکی زۆر لەزەوییەکشتوکاڵیەکان لەکەرکوك و ناوچەکەدا دێمییەو بەشێوەیەکی سەرەکی پشت بەئاوی باران دەبەستێت.[2] گەنم و جۆ بەرهەمی سەرەکی کشتوکاڵی ئەم ناوچەیەن، بەڵام برنج کەمتر لەوان دەکرێت، لە گوندەکانی دەوروبەری شاردا پاقلەوشوتیوخەیاربەرهەم دێنن، شارەکە بەشێوەیەکی گشتی کەم ئاوە، بۆیە زۆر جار پەنادەبەنە بەر بیرەکانی ناوچەکە. رووباری خاسەش لەهاویندا کزو کەم ئاوە جگەلەمانە لۆکەش بەرهەم دێت و دەچێتە دەرەوەی شار. لەپاڵ کشتوکاڵدا، ئاژەڵی زۆریش لەدەوروبەری شاردا بەخێو

[1] شمس الدين سامي: قاموس ئيعلام، ص٣٨٤٠.

[2] مجموعـــة مـــن الأكـــادميين العـــراقين : كركـــوك مدينـــة القوميـــات المتاخية،ص٢٠٢.

دەکرێت و بازاڕی کڕین و فرۆشتنی ئەسپ و ماینی عەرەبی لەم شارەدا گەرم بووە.[1]

هەر سەبارەت بەبواری کشتوکاڵی شاری کەرکوک لەوکاتەدا رۆژهەڵاتناس(بورتن) لەساڵی (١٨٨٢ز)دا سەردانی کەرکوکی کردووە، کاتێك دێتە سەر ڕەوشی ئابوری شاری کەرکوك، بەم شێوەیە ئاماژەی پێدەکات: "بەرهەمی سەرەکی ئەم شارە گەنموجۆیە، بەڵام برنج کەمترە لەوان. لەگوندەکانی دەوروبەری شاردا کشتوکاڵی پاقلەو شوتی و خەیارو بامێ و ڕەزی ترێ دەکرێ، خەڵکی بەهۆی کەم ئاوییەوە زۆرکات ڕوو لە بیروکانیاوەکان و سەرچاوە ئاوییەکانی ترو ڕووباری خاسە دەکەن. لەشاری کەرکوکدا کشتوکاڵی لۆکەش بەرهەم دەهێنرێت و لێشی دەنێردرێتە دەرەوەی شار، بەشێکی دیکەش لەهەرێمەکە، خۆیان بەئاژەڵدارییەوە خەریك دەکەن.[2]

کەمترین شت لە پرۆسەی بەرهەمی ساڵانەی کشتوکاڵیدا گەڕاوەتەوە بۆ کەمی ئاژەڵی جوتکردن، ئامرازی کار، بەشێوەیەکی تایبەتیش ئاسن و تۆو و دەستی کار بووە ئەمەی دواییان واتە، دەستی کار لە چوار وەرزەکەدا ورده ورده ژمارەی زیادی کردووە و هەرچەندە وەك سەرژمێری ساڵی (١٩٠٥) ئاماژەی پێکردووە دانیشتوانی لادێ هێشتا لە (٤٠٪) زیاتر نین،

---

[1] کوردو کوردستان: نوسینی(کۆمەڵێك لەپسپۆران ونەفسەرانی سیاسی ئینگلیز).ل٢٤.

[2] د.بدرخان السندی: المجتمع الکردی في منظور الاستشراقي، ص٤٩٢.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەندین کیلۆمەتری دووجا بەرەو خواری کەناری چەپی زێی بچوك زەوی بە پیتەو لەوکاتە. لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا کێڵراوەو ئاودێری تێدا هەبووە[1] سەبارەت بە کێشەی زەویە کشتوکاڵییەکانیش لەو کاتەدا تاپۆکردنی ڕەسمی لەسەر دەستی (مەدحەد پاشا)ی والی بەغدا هاتە کایەوە. وەك چارەسەر کردنێکی زەویە کشتوکاڵییەکان و پاشتر جێبەجێ کراو بەڕێوبەرێتیەکی تایبەتیشی بۆ دانرا لەژێر ناوی (تاپۆدائیرەسی)[2].

ئەو ئاژەڵانەشی خەڵکی بەشێوەیەکی سەرەکی گرنگی بەبەخێو کردنیان دەدەن بریتین لەمەڕوبزن و ئەسپ.[3]

بەڵام لەگەڵ ئەوانەشدا ڕەوشی کشتوکاڵی لەکوردستاندا. بەردەوام کەوتبووە بەردەم ئەوکاریگەرییە سیاسی و ئەمنییانەوە، کە کوردستان تیادا ژیاوە.[4] مەدحەد پاشاش کاتێك دەستی کردە ڕیفۆرمەکانی ئەوەی لەبنەماڵەی دەرەبەگ، یان سەرەك هۆزو سەیدوخاوەن تەریقەت نەبوایە زەوی وزاری

---

(1) راپۆرتی کارگێڕی دەڤەری کەرکوك ماوەی ١ی کانوونی دووەم ٣١ی کانوونی دووەم ١٩١٩، و. لە ئینگلیزییەوە: سەربەست کەرکوکی. ل ٦٣-٦٦.

(2) راپۆرتی کارگێڕی دەڤەری کەرکوك ماوەی ١ی کانوونی دووەم ٣١ی کانوونی دووەم ١٩١٩، و. لە ئینگلیزییەوە: سەربەست کەرکوکی. ل ٧٧.

(3) کوردستان لەچاپکراوەکانی عوسمانیدا، و. فەیسەڵ دەباغ، ل١٣٢.

(4) کامران عبدالصمد احمد دوستکی: کوردستان العثمانیە،ص ٣٣.

کشتوکاڵی بەسەردا دابەش نەدەکرد.[1] ئەو گۆڕانکارییانە کەچاکسازی لەم لایەنەوە هێنایە کایەوە، جێگیربوون و فراوان بوونی زیاتری موڵکایەتی تایبەت بووە ئەمەش پەیوەست بوو بەژمارەیەکی کەمی شێخ و ئاغاکان لەزەوی و زارە کشتوکاڵییەکانداو، کاریگەری و ڕۆڵی ئەوانی دروست کردبوو لەڕووی ئابوورییەوە.[2]

سەبارەت بە بواری بازرگانیش لە کەرکوک زیاتر پشتی بە بەرهەمە جیاوازە کشتوکاڵیەکان دەبەست، کە لەناوچە کوردیەکانەوە بەرهەم دەهات لە بازرگانە گەورەکانی شاری کەرکوکیش جولەکە بوون. هەروەها ژمارەیەك لە بازرگانە مەسیحی و بازرگانە کوردو تورکمانەکان بەشێوەیەکی بەردەوام بازرگانیان لە کەرکوك و ناوچەکانی دەوروبەریدا دەکرد زمانی کوردی و زمانی تورکی زمانی مامەڵە بووە لە بازاڕەکاندا، نمونەی ئەو بازاڕە گەورانەش بازاڕی شۆڕیجە بووە کە گەورەترین بازاڕی کەرکوك بووەو ناوەندێکی بازرگانی تایبەتیش بوو بە کوردەکان زۆرێکیش لەو گەڕیدانەی کە سەردانی کوردستانیان کردووە ئاماژەیان بە بوونی پەیوەندییەکی ئابوری گەورەی کەرکوك لەگەڵ هەرێمە کوردییەکانی دیکەدا کردووە[3].

---

[1] هاشم عاسی: شەبەك لەنێوان ئاین و نەتەوەدا، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە(١٩) زستانی ٢٠٠٤، ل١١٨.

[2] حنابطاطو:العراق(طبقات الآجتماعیە والحرکات الثوریە من عهد العثمانی).ص ٢٩.

(٣) د. کمال مظهر احمد: کرکوك و توابعها. ص ٥٧.

پاشـان بـەهۆی سیـستمی سـوڵتانی لاواز، ببـووە هـۆی بڵاوبوونـەوەی گەنـدەڵی و نائـارامی بەشـێوەیەکی بـەرفراوان دەرئەنجامی ئـەو هـەموو باجـە زۆرەی خرابـووە سـەر بەرهـەمی جوتیـاران لـەکۆتایی دەسـەڵاتی عوسمانیـدا، بـووە هـۆی ئـەوەی ژمارەیـەکی زۆر لـەجوتیارانی گوندەکان زەوییـە کشتوکاڵیەکانی خۆیان بەجێبهێڵن و کۆچ بکەن بەرەو شارو شارۆچکەکان.[1] هـەر لەسـەرەتای سـەدەی نـۆزدەوە دەوڵـەتی عوسمـانی هـەوڵی پاراسـتنی پیـشە سـازییە ناوخۆییـەکانی دەدا لـە بەرامبـەر پیـشەسازی ئەوروپیـدا.[2] بـەڵام پیـشەسازییە دەسـتییە خۆماڵیـەکان خۆیـان لەئاسـتی لێشاوی بەرهەمـە پیـشەسازییە ئەوروپییەکاندا پێ نەگیراو کەوتنە کشانەوەو وون بوون.[3]

سـەبارەت بەپیـشەسازیش لەکوردسـتاندا لەسـەر ئیـشی دەسـت و پیـشەی سـوک وەسـتابوو، ئـەوەش زیـاتر بـەهۆی دواکەوتوویی ئاستی رۆشنبیری و خوێندن و زانست و پێشکەوتن بوو لەکوردستاندا.[4] لەشاری کەرکوکیشدا کاری رستن وچنین و دروسـت کردنـی قومـاش بـاو بـووە، ئەمـە بێجگەلـە کـاری

---

[1] M. philips lips price: Ahistory Of Turky,( Form Empile To Republic) , P61.

[2] کامران عبدالصمد احمد دوستکی: ص٣٨.

[3] د.جەلیلی جەلیل: کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ، ل٧٤.

[4] کوردستان لەچاپکراوەکانی عوسمانیدا.و. بۆ کوردی فەیسەڵ دەباغ، ل١٣٢.

پێستەخۆشکەری و دروست کردنی پەت و گوریس و شتی تر لێرەدا دەتوانین بڵێین بواری پیشەسازی لەشاری کەرکوکدا لەسنورێکی تەسک و دواکەوتوودا بووە، ئەو دروستکراوانەی کەهەبوون زیاتر پیشەی دەستی بوون تەنها بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییە رۆژانەکانی نێو خۆ بوون.

نەوت لەبوارە سەرەتاییە بەکارهێنانەکەیدا، هەر لەکۆنەوە گرنگی تایبەتی خۆی هەبووە لەناوخۆی شاردا، بۆ ئاگرو روناکی بەکار هاتووە بەڵام لەسەدەی نۆزدەیەمدا دەوڵەتی عوسمانی سەرکاری دانا ئەوانیش کەسانێك بوون بەرەچەڵەك دەچوونەوە سەر هۆزی(زەنگەنە)، ئێستا پێیان دەڵێن(نەوتچی) واتە نەوت فرۆش، چونکە ئەمانە پێش ئەوەی بێن بەسەرکار کاری نەوت فرۆشیان کردووە لەکەرکوکدا، تورك لەقەبی نەوتچی زادەی پێ بەخشیون، ئەوکارکەرانەش کە کاریان نەوت فرۆشی بوو، بەسەر پشتی کەرو وڵاخ، دەیانگواستەوە بۆ نزیك شارو لەچاڵێکی گەورەدا دەیان سوتاند، پاشان لێکیان جیادەکردەوە خاوێنەکەی بەشوشەی(یەك لیتری) دەفرۆشرا بەهاوڵاتیان وپیسەکەشیان دەفرۆشت بەگەرماوەکان بۆگەرم کردنی ئاو، لەگەڵ ئەوەشدا کورەی گەچ و قسڵیان پێ دادەخست ئەم نەوتە تادەوڵەتی عوسمانی دەستی بەسەردا نەگرتبوو، هەرکەسە بۆ خۆی کاری دەکردو دەیفرۆشت. کەسیش خاوەنی

نەبوو، کاتێکیش گرنگی نەوت لە جیهاندا دەرکەوت لەکۆتایی سەدەی نۆزدەیەم دا. دەوڵەت دەستی خستە ناو کارکەرەکان و هەندێ مەرج و یاسای تایبەتی بۆیان دانا، ئیتر لێرە بەدواوە هەرکەسە نەیدەتوانی بۆخۆی کاربکات.[1]

لەشاری کەرکوک مەزاری چەند پێغەمبەرو پیاوچاکێك هەیە ئەوانیش وەك دانیاڵ پێغەمبەرو عوزێر پێغەمبەر، خەڵکێکی زۆر زیارەتیان دەکەن.[2] ئەمەش خۆی لەخۆیدا سەرچاوەیەکی دیکەی ئابوری بووە، بۆ شاری کەرکوك. چونکە لەسەرجەم وولآتاندا ناوەندە پیرۆزە گەورەکان و شوێنەوارە دێرینەکان لەگەڵ ئەوەی ناوەندێکی مێژوویی و ئاینی و شارستانین بۆ وڵات، لەهەمان کاتدا دەشبنە سەرچاوەیەکی ئابوری بۆ هەر وڵات و شارێك، کە ئەو ناوەندانەی تێدابێت.

---

[1] عەبدوڵا عەبدولکەریم مارف بەرزنجی: کارکوك لەمێژوودا. چاپی یەکەم، ئاداری- ٢٠٠١. ل ل٢٥٠-٢٥١.

[2] کوردستان لەچاپکراوەکانی عوسمانیدا. و. فەیسەڵ دەباغ، ل ١٣٢.

# باسی سێ یەم

## دۆزینەوەی نەوت لەکەرکوکدا، هەوڵەکانی وڵاتانی رۆژئاواو هەڵوێستی دەوڵەتی عوسمانی لەومیانەیەدا

پێش پێنج سەدان ساڵ پێش زاین بوونی نەوت لەناوچەی بابەگورگوڕزانراوە، نزیکەی (٢٣٠٠) ساڵ پێش ئێستاش(هێرۆدۆتس)ی مێژوو نوسی یۆنانی باسی ئاگری بابە گورگوڕی کردووە.[١] لەشوێنە نەوتیەکانی نزیک بەمزگەوتی سلێمان ئاگرێك هەبووە زەردەشتییەکان لە (٤٠٠ساڵ پ.ز) وەك سەرچاوەیەکی گەش و پیرۆزی سەیریان کردووە، بەڵام ئەو ئاگرە

---

[١] پشتیوان حسین و کارزان ابراهیم: بایەخی جیۆپۆلەتیکی پارێزگای کەرکوك، ل٩١.

ئــاگرێکی سروشـــتی بـــووەو لـــەغازێکی زۆر پێکهـــاتووەو لەبابەگوڕگوڕو دەوروبەری کەرکوك بەئاساماندا چووە.[1] سوپای عوسمـانیش هـەر لەسـاڵی (١٦٣٩ز) بـەئامرازی سـاکار(الوسـائل البدائیه)، بۆبەکار هێنانی تایبەتی خۆیان نـەوتیان دەرهێنـاوە.[2] لـەکۆتایی سـەدەی نـۆزدەو سـەرەتای سـەدەی بیـستدا نـەوتی کوردســتان بەگـشتیو ناوچـەی کـەرکوك بەتایبـەتی بایـەخی گـەورەی پەیـدا کـردو بـووە هـۆی دروسـت بـوونی سـەرەتای ململانێیەکان، بۆیەکەم جاریش لەساڵی (١٨٧١ز) یەکەم نێردەی ئەڵمانی هاتـە کوردسـتانو پاشـان چـەندین نێـردەو جیۆلـۆجی دیکەو لێکۆڵەری نوێ هاتنـە کوردسـتان.[3] کاتێکیش کوردستان لـەژێر بـاری قـاتو قڕیوبرسـێتی دەینـاڵاند نێردەیـەکی ئـەڵمانی لەکەرکوكو دەروبـەری، خـەریکی توێژینـەوەی جیۆلۆجی بوونو راپۆرتێکیـان نوســیو تیایــداناماژەیان بــەوەکرد کــە کــەرکوك دەقــەرێکی پــەترۆڵی گەورەیــەو کێڵگــە پەترۆڵییــەکانی لــەڕووی زەوییــەوە نــزیکن.[4] ئەمانــەو لەکاتێکـدا لەســەردەمی دەوڵــەتی عوسمـانیدا، بەتایبـەتی لەدەوربـەری ناحیـەی قادرکـەرەم، لەسـەر

---

[1] کمال مجید: النفط والاکراد، طبعة الثانیة، لندن-١٩٩٧، ص١٩.

[2] د. ئازاد نەقشبەندی: کاریگەری نەوتی کەرکوك لەسەر راگوێزانی کورد، ل٢٥.

[3] پــشتیوان حــسێنوکارزان ابــراهیم، بایــەخی جیۆبۆلــەتیکی پارێزگــای کەرکوك، ل٩٣.

[4] کامـەران احمـد: کوردسـتان لـەنێوان ململانێـی نێودەوڵـەتیو ناوچـەیدا، ل٣٧.

زەوییەکەی نەوت هەڵقوڵاوەو زۆر چاڵاوگەی نەوتی تیادا بڵاوبۆتەوە.[1] لێکۆڵەرە بیانیەکان لەسەدەی نۆزدەدا دوای دۆزینەوەی نەوتو لێکدانەوەی تیۆرییەکان دروست بوونیو بەستنەوەی بەباری جیۆلۆجییەوە، کەوتنە گەڕانو لێکۆڵینەوە لەباری هاوچەشنی کێڵگە نەوتیەکانی خۆیانو لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا توانیان سەرەتایەك بۆباری جیۆلۆجی ناوچەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەدەست بهێنن[2]. لەکۆتایی سەدەی نۆزدەدا رۆژئاواییەکان چاویان بڕییە بەکارخستنی کانە پڕلەنەوتەکان لە ناوچەکانی رۆژهەڵاتی ناوەندو دووردا. لەئەنجامدا پسپۆڕەکان بۆیان دەرکەوت کەرێژەیەکی زۆری نەوت لەوناچانەدا هەیە، هەرکەرۆژئاواییەکان بۆنی نەوتیان کرد، ئیدی پیاوانی پیشەسازی سەرقاڵ کردو کەوتنە ناو بازنەی بیرکردنەوەی پیاوانی جەنگو سیاسەتو چەندین نەخشەو پلانی سیاسیو بازرگانی فراوان بۆ ئەو مەبەستە پیادە کرا. هەر بەو هۆیەشەوە کۆمپانیای بیانی زۆر دامەزرانو پاشتر کەوتنە مشتومڕ لەسەر گەنجینەکانی نەوت لەکەرکوکدا.[3] لەسالی (١٨٨٣ز) لەسەر داوای سوڵتان عەبدولحەمید نێردەیەکی

---

[1] محمد هادي دفتر و عبدالله حسن: العراق الشمالي. ص ٢٧١.

[2] د.علی محمد سورداشی: جیۆلۆجیای ناوچەی کەرکوكو کاریگەری لەسەر کۆبوونەوەی نەوت، گۆڤاری سەنتەری برایەتی. ژمارە(٢٠) نیسانی٢٠٠١، ل٨٢.

[3] وەلید شەریکە: کەرکوك(توێژینەوەیەکی جیۆمێژوویی)، گۆڤاری سەنتەری برایەتی ژمارە(٢٠). ل ١٦٣-١٦٤.

سەربازی ئەڵمانی بەسەرۆکایەتی(ڤۆن گوڵتز) بۆ ڕێکخستنی کاروبارە سەربازییەکان هاتە سنوری دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ ئەوەدا ئەم نێردەیە ڕاپۆرتی دەربارەی دەوڵەتی عوسمانی ناردەوە وڵاتەکەی.[1] بەڵام لەوباروودۆخەدا ئیمپراتۆرییەتی تورکی(عوسمانی) نەیدەزانی کە پەترۆڵێکی زۆر لە خاکەکەیدا بوونی هەیەو لەهەمان کاتیشدا هیچ تێڕامانێکی نەبوو بۆی.[2] دەرەنگتر عوسمانییەکان لەڕێگای شارەزاییانەوە بەبونی نەوتی کەرکوکیان زانی،(گوڵبانگیان)* لەوکاتەدا ڕاوێژکاری دارایی سوڵتانی عوسمانی بوو. یەکەم کەسیش بوو خەبەری بە سوڵتان دا، کە ئەو مەڵبەندە(کەرکوک)، نەوتێکی زۆری تێدایە، هەر ئەم گوڵبانگیانە دواتر ٥٪ی نەوتی کەرکوک و ویلایەتی موسڵی بەرکەوت هەرلەبەر ئەوەش بوو پێیان دەوت(جەنابی سەدی پێنج).[1]

---

[1] کامەران احمد: کوردستان لەنێوان ململانێی. ل٣٧.

[2] S.H.Logrigg : Oil In The Middle East ,London, 1954 ,P13.

* کالۆست سریکس گوڵبانگیان: ئەندازیارێکی زنجی بەرەچەڵەك ئەرمەنی بوو. بەوە ناسرابوو کە شارەزاییەکی زۆری لەنهێنییەکانی دبلۆماسیی و سیاسەتی هەندەراندا هەیە. تەنانەت بە(تاڵیرانی پەترۆڵ) ناوزەند کرابوو، دواتریش بە(مستر5٪)، ڕۆڵێکی گەورەی لەدانوسانەکانی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و کۆمپانیا بێگانەکاندا هەبوو.(کامەران احمد: کوردستان لەنێوان ململانێی. ل ل ٣٨-٣٩.)

[1] لەتیف فاتیح فەرەج: کوردو کەرکوك، بەرگی یەکەم. سلێمانی٢٠٠٢. ل ٨٨.

سەرەتاش لەسەردەمی (سولْتان عەبدولحەمید)دا بوو چەندین دەستەی جیۆلۆجی پێکهێنرا لەلایەن وڵاتانی ئەوروپاوە، بۆ گەڕان بەشوێن نەوتی ناوچەی کەرکوکدا. بەڵام لەپێشدا سولْتان عەبدولحەمید ئەو گفتوگۆیانەی ئەنجامی دەدا، تەنها مەبەستی ئەوە بوو شوێنە نەوتییەکانی بۆ دیاری بکرێت. پاشان راگیرێت، بەونیازەی تا دەوڵەتی عوسمانی خۆی توانا پەیدابکات و لەدوایشدا خۆی هەستێت بەئەنجامدانی ئەو کارە، کاتێکیش سولْتان عەبدولحەمید گرنگی نەوتی بەتەواوەتی بۆ دەرکەوت، ئینجا رایگەیاند هیچ وڵاتێک بۆی نییە بەشوێن سەرچاوەی نەوتدا بگەڕێت، تا ئەوکاتەی دەوڵەتی عوسمانی بۆی دەست دەداو خۆی هەڵدەستێ بەم کارە، لەپێشدا ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا ویستی لەسولْتان نزیک ببێتەوەو هەوڵ دات رازیبکات بۆ رێپێدانی بەگەڕان بەشوێن نەوتدا لەناوچەکەدا، بۆئەم مەبەستە یەك بەیەك نوێنەری خۆی ئەنارد بۆ ئەستەمبوڵی پایتەخت بۆ گفتوگۆکردن لەم بارەیەوە، بەڵام هەموو هەوڵەکانی بێ سود بوون، پاشان ئەڵمانیا هەوڵیدا رێی پێ بدرێ بۆ بەئەنجام گەیاندنی ئەم کارە بەڵام ئەمیش لەسەرەتاوە شکستی هێنا[1]. هەر لەم کاتەدا بوو سەرمایەدارە ئەوروپییەکان ئیمپراتۆریەتی عوسمانییان کردبووە نیمچە کۆلۆنیایەکی خۆیان، لەنێو خۆشدا کۆمەڵێ لە توێژاڵی دەرەبەگە

---

[1] وەرگیراوە لە: عوسمان سەید قادر: کەرکوك شاری دێرینی کوردەواری، ل ل ٥٣-٥٥.

گەورەکانی تورکیا، لەدەوری سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم کۆبوونەوە[٢]. بەمجۆرە ئەوگۆڕانکارییە ئابوری و سیاسییانەی لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا روویاندا ململانێیان لەسەر کوردستان چڕتر کردووە، لەگەڵ ئەوەدا هەوڵە دبلۆماسیەکانیش نەیاندەتوانی بەتەنها ئەو ململانێیە رێك بخەن و بەڕێوەی بەرن، بۆیە ململانێیەکە شێوازو ئاراستەیەکی دیکەی وەرگرت.[٣] یەکەم وڵاتی ئەورووپی، کە هەوڵیدا بۆ دەستخستنی نەوتی ویلایەتی موسڵ ئەڵمانیا بوو، بۆ ئەم مەبەستەش لەساڵی (١٨٨٨ز) تورکیا مۆڵەتی ئەڵمانیایدا بۆ بونیادنانی یەکەم بەشی پرۆژەی هێڵی ئاسنی بەرلین- بەغدا.[٢] پاش ئەوە لە (١٦-مارتی١٨٨٩ز) کۆمپانیای عوسمانی بۆ هێڵی ئاسنی(Ottoman Company Of Anatolian Railway) دامەزرا، یەکەم کۆمپانیای ئەڵمانی بوو مافی جێبەجێ کردنی پرۆژەی هێڵی ئاسنی لەدەوڵەتی عوسمانی پێدرا، هێڵەکە چەند دەڤەرێکی ئەنادۆڵی دەبڕی و پاشان دەگەیشتە موسڵ و دواتریش بۆ بەغدا. لقێکی دیکەشی لێ دەبۆوە دەریای سپی بەکەنداوی فارسەوە دەبەستەوە. ئەگەر بەوردی سەیری شوێن و رێگای ئەو هێڵە ئاسنینانە بکەین، بۆمان روون دەبێتەوە هۆکاری سەرەکی ئەوململانێیە لەسەر سامان و شوێنی ستراتیژی کوردستان

---

[٢] رەمزی قەزاز: بزووتنەوەی سیاسی و رۆشنبیری کورد. ل١١.

[٣] کامەران احمد: کوردستان لەنێوان ململانێی. ل٥٥.

[٢] Habibollah Atarodi: Great Powers, Oil And The Kurd In Mosul. Pxv

بووه.[1] هەر لە ساڵی (١٨٨٩ن)دا مافی دەرهێنانی نەوت بەپێی فەرمانێکی سوڵتانی عوسمانی لە وەزارەتی داراییەوە کراوەتە موڵکی خەزێنەی تایبەتی سوڵتان. سوڵتانیش ئەو مافەی نەوتی ناوچەی بابەگوڕگوڕی بەخشی بە (سالح پاشا)، کە پاشتر بووە نائیبی کەرکوک لە پەرلەمانی عوسمانیدا[2]. پاشتر (١٩٠١ن) هەیئەتێك لەپسپۆڕانی ئەڵمانیا بەمەبەستی دۆزینەوەی نەوت سەردانی کوردستانی باشووریان کردو پاش گەڕانەوەیان هەیئەتەکە لەڕێگەی راپۆرتێکەوە حکومەتی ئەڵمانیای لەبوونی نەوتێکی زۆر لەکوردستاندا ئاگادار کردەوە، ئاماژەیان بەوە کردبوو هەرچی زووە هەوڵی بەدەستهێنانی ئیمتیازی دەرهێنانی ئەو نەوتە بدرێ، لەم رووەوە(دەروباخ– Rohrbach) سەردانی ناوچەی کەرکوکی کردو، دروستی راپۆرتی هەیئەتە ئەڵمانییەکەی بۆساغ بۆوە. ئەوەندەی نەبرد بانکی ئەڵمانی رەزامەندی(باب العالی) بەدەست هێنا، سەبارەت بەرووپێوکردنی هەرێمە نەوتیەکانی عیراق، بەمەرجێك بانکی ناوبراو لەدوای ساڵێك لەئەنجام دانی پرۆسەی رووپێوکردنەکە، رێکەوتن نامەیەك لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی مۆربکات.[1]

---

[1] کامەران احمد: کوردستان لەنێوان ململانێی، ل ل٥٥-٦٠-٦١.

[2] راپۆرتی کارگێڕی دەفەری کەرکوك ماوەی ١ی کانوونی دووەم ٣١ی کانوونی دووەم ١٩١٩، و. لە ئینگلیزییەوە: سەربەست کەرکوکی. ل ٧٦.

[1] وەرگیراوەلە: نازاد: مێژووی دۆزینەوەو دەرهێنانی نەوت لەکەرکوك، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە(١)ی هاوینی ١٩٩٩، ل ٥٠-٥١.

دکتۆر(رۆهـەر) کـە پـسپۆڕێکی ئـەڵمانی بـوو، لەوکتێبەیـدا بەناوی(ڕێگـای بەغـدا) دایـنـابوو، دەربـارەی پـەترۆڵی کوردسـتان نوسـیبووی:" خـۆم سـەردانی سەرچاوە پەترۆلیـەکانی کـەرکوکم کرد. هەروەها سەردانی سەرچاوەکانی تریشم کرد لەدەوروبـەری بابەگوڕگوڕ. لەهەردو دەڤەرەکەدا ئەو دیاردەیەم بینی کە شایانی بایەخ پێدانە. پێویستە ئێمە بایەخێکی گرنگ بەو کارانە بدەین وایکردووە هێڵی ئاسنی بەنزیك ئەو دەڤەرە پەترۆڵیەدا بچێت. ئـەوەی ئێمـە لێـی دەترسـێن ئەوەیـە ئـاڵتونی بێگانـەو ئەوانـەی بـەدوای شـوێنەواردا دەگـەڕێن لەپێـشەوە سـەرکەوتن لـەمافی بەدەسـتهێنانی پـەترۆڵی کوردسـتان بەدەسـتهێنا، بەرلـەوەی ئێمـە(ئەڵمانـەکان) دەستپێـشخەری کاریگـەری ئـەنجام بـدەین.[٢] بەمجۆرە لەساڵی (١٩٠٢ز) چیاوگی کۆتـایی دامەزراندنی هێڵەکە لەنێوان ئەڵمانیاو دەوڵەتی عوسمانی مۆرکرا.[٣]

لـە ساڵی (١٩٠٣ز) ئـەڵمانیا مۆڵـەتی فراوانکردنـی زیـاتری هێڵەکەی وەرگرت تـاوەکو بەسـرە.[١] لەهـەمان سـاڵدا کۆمپانیـای هێڵــی ئاســنی ئــەنادۆڵ، کۆمپانیایــەك بــوو بــانکی ئــەڵمانی لەسەرمایەکەیدا بەشدار بوو. ڕێگەی پێدرا هێڵی ئاسنی نێوان بەغداو بەرلین دروست بکات، یەکێك لەبەندەکانی ڕێکەوتن نامەی نێـوان ئـەم کۆمپانیایـەو دەوڵـەتی عوسمـانی ئامـاژەی بۆئـەوە

---

[٢] کامەران احمد: کوردستان لەنێوان ململانێی...، ل٦٦.

[٣] کامەران احمد: کوردستان لەنێوان ململانێی، ل٦٤.

(1) Habibollah Atarodi: Great Powers, Oil And The Kurd In Mosul. Pxv

کردبوو. ئەم کۆمپانیایە بۆی هەیە بگەڕێت بەشوێن گشت ئەو کانزایانەی ئەکەونە ئەملاولای هێڵەکە بەپانتایی (٢٠کم) بۆ هەر لایەك. بەمەش ئەوناوچە نەوتیانەی کەوتبوونە رۆژهەلات و رۆژئاوای رووباری دیجلەوە کەوتە ژێر دەسەلاتی ئەم کۆمپانیایەوە. ئەوسەردەمە وا هەست دەکرا ئەو ناوچەیە ناوچەیەکی نەوتییە، بەلام ولاتە دەسەلاتدارەکانی تر، وازیان نەهێناو هەرلەهەولدا بوون، بۆبەدەستهێنانی مافی دەرهێنانی نەوت لەو هەرێمانەدا بەهەر جۆرە رێگایەك بێت.[٢]

هێلی ئاسنی که ئاسیای بچوکی دەگرتەوە پاشان بۆ بەغداو لەوێشەوە بۆ کەنداو، ولاتە زلهێزەکانی دیکە پێیان وابوو بەشێوەیەکی تایبەتی ئەم پرۆژەیە پرۆژەیەکی خەیالیەو ناتوانێت بەو جۆرە تەواوبکرێت کە نەخشەی بۆ کێشراوە، لەگەل ئەوەشدا کۆمەلێك بارگرانی سیاسی گەورە لەخۆدەگرێت بۆ ئەلمانیا لەهەرێمە دواکەوتووەکاندا.[١] دەولەتی عوسمانیش لەسەرەتای سەدەی بیستدا گەیشتبووە لوتکەی بێ هێزیو

---

[٢] وەرگیراوە لە: عوسمانی سەید قادر: کەرکوك شاری دێرینی کوردستان، ل ٥٦.

[١] نجدە فتحی صفوة: العراق في مذکرات دبلوماسیین الاجانب، طبعة الثانیة، بغداد-١٩٨٤، ص٦١.

لاوازیو چـەندین کێشەی کۆمەڵایـەتیو نەتـەوەیی هەڕەشـەی لەوکیانەدەکرد.[٢]

لەساڵی (١٩٠٤ن) ئەو کۆمپانیایە، دەستی کرد بەتوێژینـەوە لەسەر ئەو زەوییانەی ئیمتیازەکە دەیانگرێتەوە، پاشان دەستی کرد بەنەخشەی ڕاکێشانی هێڵی شەمەندەفەرەکە، بۆئەوەی کەڵك لەمافەکانی خۆی لەبەکارخستنی ئەو ناوچەکانزاییو نەوتیانـە وەربگرێـت. ئەمـەش خـۆی لەخۆیـدا بایـەخێکی نێودەوڵـەتی زیـاتری لەسـەر ئـەو ئیمتیـازی نەوتـە هێنایـە ئـاراوەوگفتوگۆو مـشتومڕی زیـاتری دەوڵـەتی عوسمـانیو کۆمپانیـا ئەڵمانییەکـە لێکەوتەوە.[٣] لەلایـەکی ترەوە، بەپێی ڕایەکی دیکە، کۆمپانیـای نـەوتی لەویلایـەتی موسڵ(باشـوری کوردسـتان)، لـە سـوڵتانی عوسمـــانی وەرگـــرت. بـــەپێی یـــەکێك لەبەنـــدەکانی دیکـــەی مەرجەکانی ئیمتیازەکە، دەبوایە کۆمپانیاکە دەست بەجێ دەست بکات بەدۆزینەوەی نەوت، بەڵام بەهۆی خەریك بوون بەڕاکێشانی ئاسنە ڕێـی بەغـداوە دواکـەوت هەرلەبـەر ئـەوەش بـوو، لەسـاڵی (١٩٠٦ن) بـە بەهانـــەی ئـــەوەی دۆزینـــەوەی نـــەوت دواکـــەوت، سـوڵتانی عوسمـانی ئیمتیازەکـەی ئـەڵمانیای وەسـتاند.[١] بـەڵام

---

[٢] د.کـاوس قـەفتان: الأنتفاضـات البـارزانیـه(صـفحات مـن الحرکـة القومیـة التحرریة الکردیة في النصف الاول من القرن العشرین)، مطبعة سرکوتن. – ٢٠٠٢، ص١٥.

[٣] وەلید شەریکە: کەرکوك توێژینەوەیەکی جیۆمێژووییە. ل١٦٤-١٦٥.

[١] د.عەبدوڵا غەفور: نەفت لەکوردستاندا، چاپی دووەم، سلێمانی– ٢٠٠٣، ل ٣١.

لەساڵی (١٩٠٧ز) بۆجارێکی دیکە نێردەیەکی ئەڵمانی سەردانی کوردستانی کردەوەو جەختی لەسەر ئەوە کردبووەوە، کە کوردستان لەسەر دەریای نەوت مەلەدەکات.[٢] دەوڵەتی عوسمانی پێش ئەوساڵە رێگای بەبەریتانیا دابوو کەکاری پشکنین لەناوچەکەدا بکات، پاشان لەساڵی (١٩٠٩ز) تیمەپشکنەرەکانی بەریتانیا لە ناوچەکەدا بەدوای کانە جۆربەجۆرەکاندا دەگەڕان.* [١] (١٩٠٨ز) سوڵتان ئیمتیازیدا

---

[٢] پشتیوان حسین و کاروان کەریم: بایەخی جیۆپۆلەتیکی پارێزگای کەرکوک، ل٩١.

* سەرەتای پەیوەندی بەریتانیا لەگەڵ ئەو ناوچەیەی ئێستاپێی دەوترێت عێراق، دەگەڕێتەوە بۆ (١٥- کانونی دووەمی-١٧٦٦ز)، کەبۆ یەکەمجار حکومەتی بەریتانیا نوێنەرێکی خۆی لەبەغدا دانا حکومەتی بەریتانیا بۆ دۆزینەوەی بازاڕی پێویست. تاکو کاڵای خۆی تیادا ساغ بکاتەوە، لەساڵی (١٨٣٤ز) رەزامەندی حکومەتی عوسمانیوەرگرت بۆ بەکارهێنانی ناوی دیجلەو فورات بەمەبەستی هاتوچۆو هێنانوبردنی. کەلوپەلەکانی بەریتانیاش، بۆ زیاتر جێگیرکردنی پێگەی خۆی پەیوەندی هاوکاری بازرگانی خۆی خۆش کرد، لەگەڵ ئێران و شێخەکانی کەنداو. تا ئەوکاتەی بەریتانیا بوو بەهێزێکی سەرەکی لەناوچەی کەنداو. بەمجۆرە جوڵانەوەی بازرگانیشی بەسەر هەموو ناوچەکەدا زاڵبوو. زۆربەی کەرەستە هاوردەو ناردەنییەکانیش لەویلایەتەکانی بەغداو بەسرەو موسڵ کەوتنە ژێر کۆنترۆڵی کۆمپانیای بەریتانیەوە.( وەرگیراوە لە جەلال جەوهەر: هەشتا ساڵ تەعریبکردنی کوردستان. گۆڤاری کەرکوک ژمارە(٤)ی ساڵی ٢٠٠٠- ل٣.)

[١] لەتیف فاتیح فەرەج: کوردو کەرکوک. ل ٥٠.

بەكۆمپانیای(ولیەم دارس) بۆ گەڕان بەشوێن نەوتدا، بەڵام لەساڵی (١٩٠٩ز)دا حكومەتی توركیای لاو ئەو گەڕان‌و پشكنینەی گواستەوە بۆ وەزارەتی كانگەكان[٢].

هەر لەساڵی (١٩٠٨ز) دا كاتێك پەرلەمانی عوسمانی باسی دامەزراندنی هێڵێكی كردبوو، لەباكوری كوردستانەوە بێت‌و پاشان بۆ موسڵ‌و لەوێوە بەرەو كەركوك بڕوات. (چیستەر) كە ئەدمیراڵێكی ئەمریكی بوو، بەخێرایی خۆی گەیاندە ئەستەمبوڵ، لێرەدا ئەوەی پەیوەندی بەمێژە ئاسنەكەوە هەیە هەمووی لەسەر خاكی كوردستان بووە.[٣] لەم كاتەشدا ململانێیەكی بەهێز لەنێوان وڵاتانی زلهێزی وەك بەریتانیاو فەرەنساو ئەڵمانیاو ڕوسیادا هاتبوە كایەوە بۆ دەست بەسەرا گرتنی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، كوردستانیش هەرێمێكی دەوڵەمەندو گرنگ بوو لە ڕوی ستراتیژییەوەو پێگەیەكی تایبەتی لەو ململانێیەدا هەبوو بە ماوەیەك پێش دەستپێكی جەنگی جیهانی سەرجەمی ئەو وڵاتە زلهێزانە كاریان دەكرد لە پێناو سەپاندنی هەیمەنەی خۆیان لە كوردستانداو دەستگرتن بەسەر سەرچاوەكانی سامانی ئەم وڵاتەدا. پاشان بەستنەوەی ئابووریەكەی، بە بازاڕەكانی خۆیانەوە، لێرەشدا نەوت یەكێك لە فاكتەرە گەورەكانی ئەو ململانێ‌و جوڵانەوەوانە بوو. هەر لە دەستپێكی كارەكانی ژمارەیەك لە جیۆلۆجیە ڕۆژئاواییەكانەوە، تاوەكو كۆتایی

---

[٢] د. ولید حمدی: كوردو كوردستان لەبەڵگەنامەكانی بەریتانیادا، ل ٢٣.

[٣] كامەران احمد: كوردستان لەنێوان ململانێی، ل٦٨.

سەدەی (١٩) جەختیان لەسەر بوونی کۆماوی گەورەی نەوت کردەوە لە بابەگوڕگوڕ[١].

بەمجۆرە لەسەرەتاو دەستپێکی سالانی سەدەی بیستدا، کۆمپانیاو کارگە نەوتیەکانی جیهان لەڕووی بەرهەم هێنان و توانای دامەزراندنیانەوە، بەشێوازێکی گەورەو لەبەرچاو فراوان دەبوون. [٢] پاشتر لەسالی (١٩١١ز) ولاتان لەسەر ئەوە ڕێکەوتن، کۆمپانیا ئەلمانیەکە مافی تەنها بەکارخستنی نەوت بەدوو کۆمپانیای ئینگلیزی بفرۆشێت. یەکەمیان کۆمپانیای نەوتی ئینگلیزی-فارسی کەخاوەنی ئیمتیازی نەوتی ئێرانە. دووەمیشیان کۆمپانیای(رۆیال-شل)ە، لەبەرامبەر(٢٤,٠٠٠)بەش لەکۆی(٨٩,٠٠٠) لەدوای ئەوەش هەموو بەشدار بووان کۆمپانیایەکیان پێکهێنا بەناوی(کۆمپانیای ئیمتیازە ئەفریقی و ڕۆژهەلاتیە سنوردارەکان)، کەبریتی بوون، لە ولاتانی بەریتانیاو ئەلمانیاو هۆلەندا. ئەو کۆمپانیایە لەماوەیەکی کورتدا دووجار پێکهێنرایەوە، تاوەکو سەرەنجام بەناوی(کۆمپانیای نەوتی تورکی سنوردار) ناسرایەوە، ئەوەش لە کۆتایی سالی (١٩١٢ز)دا بوو. ئیمتیازەکەی باشتر کرد، بەمەرجی گونجاوتر، لە بەکارخستنی نەوتی هەردو ویلایەتی

---

(١) وەرگیراوە لە: د. جبار قادر: السياسات الحكومية بحق الكورد في كركوك، ص ١٨٩.

(2)S.H. Longrigg: Oil In The Middle East, p.16.

بەغداو موسڵ، کەرکوکیشی لەگەڵدا بوو. ئەمەش بەهۆی هەوڵەکانی هەردوو باڵیۆزی بەریتانیاو ئەڵمانیا لە ئەستەمبوڵ.[1]

لەکۆتایدا ئەگەر سەیرێکی سەرجەم ململانێکانی وڵاتە زلهێزەکان بکەین، لەویلایەتی موسڵ(کوردستانی باشور)دا، ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە ئەگەر ململانێکان لەسەر سەرجەم ئەم هەرێمە بووبێت، ئەوا دەتوانین بڵێین شاری کەرکوک لەوکاتەدا چەقی ئەو ململانێیە بووە، هەروەها سەرچاوە پەترۆلیەکانی کەرکوک، لەگەڵ ئەوەی رۆڵێکی گەورەی هەبووە لەگۆڕینی ئاراستەی پرۆژەی هێڵە ئاسنییەکەی: بەرلین، بەغدا، بەسرە. لەهەمان کاتدا رۆڵێکی گەورەیشی هەبووە، لە گۆڕینی ئاراستەی سیاسی و دیپلۆماسی و سەربازییەکانی وڵاتە زاهێزەکانی ئەوکات.

هەربۆیە بەریتانیا بەر لەهەڵایسانی جەنگی جیهانی یەکەم، کەوتبووە خۆ ئامادەکردن و پلان دانان بۆ داگیرکردنی میزۆپۆتامیا. ئەم راستیەش زۆر بەڕوون و ئاشکرایی لەو بۆچوونەی(لۆرد کێرزن)دا ئاشکرا دەبێت کە لەساڵی (١٩١١ز).دا لەبەردەم ئەنجومەنی لۆرداتی بەریتانیادا دەری بڕی و وتی:"هەڵەیەکی گەورەیە گەر وابزانرێت بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا تەنها لەناوچەی کەنداودا قەتیس دەخوات، یان لەناوچەکانی نێوان بەغداوبەسرە کۆتایی دێت، بەڵکو زۆر لەوە دورتر تێدەپەڕێت، کە بێگومان لێرەوە مەبەستی ویلایەتی

---

[1] وەلید شەریکە: کەرکوک، توێژینەوەیەکی جیۆمێژوویی، ل١٦٥.

موسڵ(کوردستانی باشور)ە. ئاشکرایە کوردستان لە نەخشەی سیاسەتی بەریتانیادا شوێنێکی دیارو بەرچاوی هەبووە، هەرچەندە کوردستانی باشور زیاتر مایەی گرنگی پێدان بوولای بەریتانیا لەچاو پارچەکانی دیکەی کوردستاندا.[1]

هەوڵەکانی کۆمپانیا بەریتانیەکانیش، بۆ دەستکەوتن و دەست بەسەرا گرتنی نەوت لە کوردستانی باشوردا فاکتەرێکی سەرەکی و گەورەبوو لەوەی، کە پاڵی بە حکومەتی بەریتانیاوە نا بۆ دەست بەسەرا گرتنی ویلایەتی موسڵ"[2].

---

[1] وەرگیراوە لە ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: شاری سلێمانی، ل٨٠.

[2] وەرگیراوە لە: د. جبار قادر: السیاسات الحکومیة بحق الکورد في کرکوك، ص ١٨٩.

# ئەنجام

لە ئەنجامی سەرجەم ئەوزانیاریاریانەی لە سەرچاوە بیانی و ئیسلامییەکان وەرمانگرتن و لەئەنجامی ئەوبەڵگانەشی، لە وڕاستیانە هەڵمانهێنجان، دەتوانین بڵێین گەیشتونەتە چەند ڕاستیەك کە لەچەند خاڵێکی سەرەکی دا بەکورتی ئاماژەیان پێدەکەین :-

یەکەم: شاری کەرکوك لەدێرزەمانەوە و لەسەرجەم قۆناغە مێژووییەکاندا شوێنی ژیان و ناوەندێکی گرنگی پێ دراو بووە، لەلایەن دانیشتوان و چ دەسەڵاتدارانەوە هەر لەکۆنیشەوە پایتەختی گوتێکان بووە، کەلقێکی سەرەکیو گرنگی دانیشتوانی کوردستانی کۆن بوون. کۆنترین خەڵکانێکیش بوون کەڕۆڵێکی گەورەیان لەبونیادنانی شاری(ئارابخا) هەبووە.

دووەم: بەپێی ئەو زانیاریانەی لە ئینسکلۆپیدیای بیانی ئیسلامی هەروەها ڕاو بۆچوونەکانی کەسانی بیانی و عەرەب و

تورك وكورد لەبارەی سنوری جوگرافی کەرکوك و کوردستاندا، گەیشتینە ئەوڕاستیەی کەرکوك دەکەوێتە نێو سنووری جوگرافیای کوردستانەوەوخاکی کوردستانیش بەپێی ئەو دەستنیشانکردنانەی لەسەرچاوە جیاوازەکانەو پێی گەیشتین، سنورەکەی زور زیاتر دەکەوێتە بەشی باشورو ڕۆژئاوای شاری کەرکوکەوە.

سێیەم: ئەو گۆڕانکارییە ئیدارییانەی لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەوە دەوڵەتی عوسمانی بەئەنجامی گەیاند تەنها بۆ قایم کردنی پێگەی دەسەڵاتو کۆنترۆڵی خۆی بووە بەسەر ناوچەو هەرێمەکانی ژێردەسەڵاتیدا نەك بۆئاسانکاری ڕەوشی ئیداری لەسەرجەم ناوچەکان بەگشتیو ویلایەتی موسڵ بەتایبەتیداو بێگومان کەرکوکیش لەوساڵانە بەدواوە بەشێك دەبێت لەوویلایەتی موسڵ.

چوارەم: بەپێی سەرجەم ئەوسەرژمێری دانیشتوانەی شاری کەرکوکی نیوەی دووەمی سەدە نۆزدە تاسەرەتای سەدەی بیست لەسەرچاوە بیانی وئیسلامییەکانەوە وەرمانگرت ئەوەیە لەو قۆناغەو قۆناغی دواتری ئەم شارەدا، زۆرینەی دانیشتوانی شاری کەرکوك کورد بوون، بەڵام دەوڵەتی عوسمانی هەرلەسەرەتای هاتنی دەسەڵاتی بۆئەم شارە ژمارەیەك خێزانی تورکمانی لەکەرکوكو ناوچەکانی دەوروبەری نیشتەجێ کردووەو تاکۆتایی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستیش چیاوگێکی گەورەی لەسەرجەم لایەنەکانەوە بەخشیبوو بەو خێزانانە، یەکێکیش لە ڕیفۆرمەکانی (مەدحەدپاشا) کەلەسێ

ویلایەتەکەی ئەوکاتەی عێراقدا کوردی هێنانی ژمارەیەك لەعەشیرەتە عەرەبە کۆچەریەکان بوو بۆدەشتەکانی گەرمیانی ناوچەی کەرکوك، لێرەدا دەتوانین بگەینە ئەوڕاستیەی کە دەسەلاتی دەولەتی عوسمانی لەم شارەدا لەسەرجەم قۆناغەکاندا بەگشتی و کۆتایی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیست بەتایبەتی سەرەتایەکی گەورەی نیشتەجێ کردنی تورکمان وعەرەب بووە لەم شارەو ناوچەکانی دەوروبەریدا، بەشێوەیەکی دیکە سەرەتایەکی گەورەی سیاسەتی تەتریك و تەعریب بووە بەئاراستەی ناوچەکانی گەرمیان وکەرکوك.

پێنجەم: سیاسەتی دەولەتی عوسمانی لەم شارەدا ج بەئاراستەی کورد ج بەئاڕاستەی کەمینە نەتەوەکانی دیکە ی نێوشار، دەتوانین بلێین لەسەرجەم لایەنەکانەوە سیاسەتێکی نێگە تیڤانەبووە بەجۆرێك بەردەوام دەولەتی عوسمانی لەژێرفەرمانی سولتان عەبدولحەمیدو سیاسەتی سەنتەریالیستی حکومەتدا، ئەوسیاسەتەی بەئاڕاستەی بەرژەوەندیەکانی خۆی هەلسوڕاندووە.

شەشەم: سەبارەت بەرەوشی خوێندن وفەرهەنگیش لەم شارەدا گەیشتینە ئەو ڕاستەی لەکۆتایی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستدا لە دۆخێکی دواکەوتودابووە، ڕیفۆرمەکانی مەدحەد پاشاش گۆڕانکارییەکی فەرهەنگی وەهای لەویلایەتی موسلدا نەکرد تاوەکو ئەو گۆڕانکارییە ببێتە خالی وەرچەرخانی رەوشی خوێندنو خوێندەواری لەویلایەتەکەدا بەگشتیو شاری کەرکوك بەتایبەتی، ،بەلام ئەگەر بەبەراورد

وەریگـرین ئـەوا خوێنـدنگاو قوتابخانـە مەسـیحیو جولەکـەکان لەچاو ناوەندەکانی خوێندنی دەوڵەتی عوسمانیدا پێشکەوتوو تربووە، وە هێنانو دامەزراندنی یەکەم چاپخانەش لە کوردستان لە شاری کەرکوك بووە.

حەوتەم: لەڕوی ئابوریشەوە گەیشتینە ئەوڕاستییەی شاری کەرکوك هەر لەکۆنەوە یەکێك بووە لەڕێگا سەرەکییەکانی کاروانە بازرگانیـەکان، بـەهۆی کەش‌وهـەواو سەرچـاوەکانی ئـاوی وەك ڕووبـاری خاسـەو کانیاوەکانییـەوە لـەڕووی کشتوکاڵیـشەوە شـوێنی بەرهـەم هێنـانی چـەندین جـۆر میـوەو دانەوێڵـەبووە، پیشەی دەستیش یەکێکی دیکە بووە لە وسەرچاوە ئابورییانەی کەدانیشتوانی شار بۆ بژێوی ڕۆژانـەیان پشتیان پـێ بەستووە ،بـەلاّم خـەڵك و دانیـشتوانی ئـەم شـارە بەشـێوەیەکی کـەم توانیویانـە سـود لەسەرچـاوە ئابوریـە گرنگەکـەی وەرگـرن کـە ئـەویش سەرچـاوە پەترۆڵیـە دەوڵەمەنـدەکانی ئـەم شـارەیە، لەکاتێکـدا هەرلـەکۆتایی سـەدەی نـۆزدەوە بووەتـە ناوەنـدێکی گەورەی ململانێ لەنێو زلهێزەکانی ڕۆژئاوا لەلایەكو زلهێزەکانو دەوڵـەتی عوسمـانی لەلایـەکی دیکـەوە، هـەر گرنگـی ئابوریـە پەترۆڵیەکەشی بووە لەوکاتـەوەو تائێستاش ئەم شارەی کردە ناوەنـدێکی گـەورەو ململانـێو مـشتومڕو کێشمەکێـشی نێـو زلهێزەکان، هەرلەو قۆناغەی کۆتایی سەدەی نۆزدەدا کەزانرا ئەم شـارە سەرچـاوەیەکی پـەترۆڵی گەورەیـەو هەتائێـستاش ئـەم گرنگـی پێـدانو ململانێیـە هەربەردەوامـەو ڕۆژ بـەڕۆژ لـەزیاد بووندایە.

# لیستی سەرچاوەکان


**یەکەم/سەرچاوە کوردییەکان**

**١-ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی:**

شاری سلێمانی، چاپی یەکەم، چاپخانەی زانست، سلێمانی- ٢٠٠٢.

**٢-ئەمین قادر مینە:**

ئەمنی ستراتیژی عێراق و سێکوچکەی بەعسیان، تەرحیل،تەرعیب، تەبعیس، چاپی چوارەم، سلێمانی-١٩٩٩.

**٣- ئۆ.ل.ڤیلچڤسکی:**

نەژادی کورد، وەرگێڕانی رەشاد میران، چاپی دووەم، هەولێر-٢٠٠٠.

**٤- ئەتڵەسی کەرکوک:**

دانانی لیژنەی باڵای بەرەنگاربوونەوەی بەعەرەبکردن لە کوردستان، چاپی یەکەم، هەولێر-٢٧٥٠ی کوردی-٢٠٠٥ز.

**٥- پشکۆ حەمە تاهیر ئاغجەلەری:**

راپەڕینی کەرکوکۆ ساڵی ١٩٩١، چاپی یەکەم، سلێمانی- ٢٠٠٤.

٦- جەلال ئەمین بەگ:

جوگرافیای کوردستان، سلێمانی -١٩٩٨.

جەلیلی جەلیل:

٧- هەندێ سیمای ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کلتوری کورد، وەرگێڕانی ئەنوەر قادر محمد، ستۆکۆڵم-١٩٩٣.

٨- کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، وەرگێڕانی لەڕوسییەوە د.کاوس قەفتان، بەغداد-١٩٨٧.

٩- جوگرافیای هەرێمی کوردستانی عێراق، دانانی کۆمەڵێك مامۆستای زانکۆ، هەولێر-١٩٩٨.

١٠- جەزا تۆفیق تالیب، دەستنیشانکردنی سنوری هەرێمی کوردستان، عێراق، سلێمانی-٢٠٠٤.

د.عەبدوڵا غەفور:

١١- نەفت لەکوردستاندا، چاپی دووەم، سلێمانی ٢٠٠٣.

١٢- جوگرافیای کوردستان، چاپی چوارەم، هەولێر-٢٠٠٥.

١٣- عەبدوڵا عەبدولکەریم مارف بەرزنجی:

کەرکوك لەمێژوودا، چاپی یەکەم، ئاداری ٢٠٠٤.

١٤- د.عەبدوڵڵا ئالیاوەیی: کوردستان لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەوە تاوەکو جەنگی جیهانی یەکەم، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی، چاپی یەکەم، سلێمانی- ٢٠٠٤.

١٥-کەیوان ئازاد ئەنوەر:

چەند لاپەرەیەك لەمێژووی نوێو هاوچەرخی گەلی کورد، چاپی دووەم، سلێمانی-٢٠٠٠.
١٦-کوردو کوردستان، ن: کۆمەڵێك لە ئەفسەرانو پسپۆرانی ئینگلیز، و. حسین عوسمانو حسین ئەحمەد، چاپی یەکەم، هەولێر – ٢٠٠٢.
١٧-کامەران ئەحمەد:
کوردستان لەنێوان ململانێی نێودەوڵەتیو ناوچەیدا (١٨٩٠ – ١٩٣٢)ن،چاپی یەکەم، سلێمانی -٢٠٠٠.
١٨- کوردستان لەچاپکراوەکانی عوسمانیدا، فەیسەڵ دەباغ لە تورکی عوسمانییەوە کردویەتی بەکوردی، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٤.
١٩- کەریمی زەند:
کوردستانی پەرتکراو، چاپی یەکەم، سلێمانی-٢٠٠٢.
٢٠- محمد سەعید سۆفی:
پارێزگای کەرکوك لەناو پاکتاوی رەگەزیدا، ٢٠٠٢.
٢١- میهرداد ئیزەدی:
ئاینوتایفە ئاینییەکان لەکوردستان، وەرگێرانی لە ئینگلیزییەوە کامەران فەهمی، چاپی یەکەم، سلێمانی-٢٠٠٢.
٢٢- د.نوری تاڵەبانی:
سیاسەتی بەعەرەبکردنی کەرکوك، وەرگێرانی مەریوان حسین چیمەنی: سلێمانی٢٠٠٢.
٢٣- نوری حەیدەر هەمەوەندی:

مێژووی شاراوەنی هەمەوەند، چاپی یەکەم، سلێمانی-
.٢٠٠٢

٢٤- لەتیف فاتیح فەرەج:

کوردوکەرکوك، بەرگی یەکەم، سلێمانی ٢٠٠٢.

٢٥- لیوس.ا.مایەر:

داستانە جیهانییە هەرمگەورەکان، وەرگێڕانی بۆ عەرەبی غانم دەباغ، وەرگێڕانی بۆ کوردی د.کاوس قەفتان. ٢٠٠٢.

٢٦- د.خەلیل ئیسماعیل:

رۆڵی رەهەندی نەتەوەیی لەگۆڕینی سنوری کارگێڕی پارێزگای کەرکوکدا، وەرگێڕانی لەعەرەبیەوەد.جەزا تۆفیق تالیب، چاپخانەی گەنج، ٢٠٠٥.

٢٧- خەبات عەبدوڵا:

بنەماتیۆرییەکانی جوگرافیای عەسکەری کوردستانی باشور، چاپی دووەم، سلێمانی٢٠٠٥.

٢٨- حەسەن ئەرفەع:

کوردەکان،(لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە)، وەرگێڕانی سەردار محمد، سلێمانی٢٠٠١.

٢٩-حکومەتی هەرێمی کوردستان: ڕاگەیاندنی پارێزگای کەرکوك چوار ساڵ کارو خزمەتو بوژانەوەو ئاشکرا کردنی سیاسەتی راگواستنو تەعریب، سلێمانی - ٢٠٠٣.

٣٠- چەند وتارێکی کوردناسی، ئەنوەر قادر محمد لەڕوسییەوە کردویەتی بەکوردی،دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی-٢٠٠٤.

٣١- س.ج. ئەدمۆنز:

کورد تورك عەرەب، وەرگێڕانی لەعەرەبییەوە حامیدی گەوهەری. چاپی دووەم، هەولێر٢٠٠٤.

٣٢- سەلام ناوخۆش:

هۆکارەکانی لکاندنی ویلایەتی موسڵ بەعێراقی عەرەبییەوە، چاپی یەکەم کوردستان-٢٠٠٠.

٣٣- شۆڕشی حاجی:

تەعریبی کەرکوك،چاپخانەی شڤان، سلێمانی-٢٠٠٢.

٣٤- د. شاکر خەسباك:

کوردو مەسەلەی کورد، وەرگێڕانی لەعەرەبییەوە، نەجمەدین شاکەلی، چاپی دووەم، هەولێر-٢٠٠٥.

٣٥- شەرەفخانی بتلیسی:

شەرەفنامە، وەرگێڕانی بۆ زمانی کوردی هەژار، چاپخانەی نعمان، ١٩٧٢.

٣٦- شێخ محەمەدی خاڵ:

دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی، چاپی یەکەم، سلێمانی-٢٠٠٣.

٣٧- شێخ ندیم الجسر:

داستانی ئیمان لەنێوان فەلسەفەو زانستو قورئان. وەرگێڕانی نوری عەبدوڵا ساڵح، چاپی یەکەم، هەولێر-٢٠٠٣.

٣٨-شوان عوسمان مستەفا:

کوردستان و پرۆسیسی بە ئیسلام کردنی کورد، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە، دەزگای چاپ و پەخشی تەما، سلێمانی – ٢٠٠٢.

٣٩- رەمزی قەزاز:

بزوتنەوەی سیاسی و رۆشنبیری کورد(لەکۆتایی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستدا، سلێمانی-١٩٧١.

٤٠-د. رەشاد میران:

رەوشی ئاینی ونەتەوەیی لەکوردستان، چاپی دووەم، ٢٠٠٢.

٤١-راپۆرتی کارگێری دەڤەری کەرکوک (ماوەی ١ی کانونی دووەم – ٣١ کانونی دووەمی ١٩١٩) و. لە ئینگلیزییەوە: سەربەست کەرکوکی، چاپخانەی شڤان، سلێمانی ٢٠٠٦.

٤٢- فاتیح عەبدولا:

پارێزگای کەرکوک، چاپی یەکەم،چاپخانەی رامان- سلێمانی ٢٠٠٥.

## دووەم/سەرچاوەو كتێبەكان بەزمانی عەرەبی

٤٣-ابن خلدون:

مقدمه، المجلد الأول،دارالكتاب المصرى، قاهرة،١٤٢٠و-١٩٩٩م.

٤٤-د.ابراهيم خليل احمد: تطور تعليم الوطني في العراق (١٨٦٩-١٩٣٢)، منشورات مركز دراسات الخليج العربي بجامعة بصرة، طبعة الاولى، بصرة(١٩٨٢).

٤٥-احمد رشيد احمد بيبانى:

كركوك الجريحه، طبعة الأولى، سليمانيه-٢٠٠٤.

٤٦-احمد شناوى:

دائرة المعارف الأسلامى، المجلد ثانى العشر.

٤٧-العقيد محمد اسدلله صفا:

الأسكندر المقدونى الكبير، طبعة الأولى، بيروت-١٩٨٥.

٤٨-بدرخان سندى:

المجتمع الكردى في منظور الاستشراقى، اربيل-٢٠٠٢.

٤٩-جرجيس فتح الله:

يقظه الكرد، تأريخ السياسى١٩٠٠-١٩٢٥، طبعة الأولى، اربيل-٢٠٠٢.

٥٠- جمال رشيد وفوزى رشيد:

تأريخ الكرد القديم، اربيل-١٩٩٠.

د. جمال رەشيد

٥١- دراسات كردية في بلاد سوبارتو، بغداد-١٩٨٤.

٥٢-كركوك في عصور القديمه، طبعة الأولى، اربيل-٢٠٠٢.

٥٣-د.حسين الضيقه:
الدولة العثمانيه،(دراسات الاجتماعه والسياسيه)، طبعة الأولى، بيروت-لبنان، ١٤١٧هـ-١٩٩٧م.
٥٤-حنا بطاطو:
العراق(طبقات الأجتماعيه والحركات الثوريه من عهدالعثماني حتى قيام الجمهورية)، ت.عفيف الرزاز، طبعة ثانيه، لبنان-١٩٩٥.
٥٥-دبليو-ارهاي:
سنتان في كردستان، ت.فؤاد جميل، ج.الأول، بغداد-١٩٧٣.
٥٦-د.زرار صديق توفيق:
كردستان في قرن الثامن الهجري،(دراسة في التأريخ السياسي والأقتصادي)، طبعة الأولى اربيل-٢٠٠١.
٥٧-ستيفنس.هـ. لونگريك:
اربعة القرون من التأريخ العراق الحديث، ت.جعفر خياط، طبعة الأولى، بغداد-١٩٤١.
٥٨-د.عبدالرحمن قاسملو:
كردستان والأكراد، لبنان- بيروت.
٥٩-عبدالمجيد فهمي حسن:
مشاهر الالوية العراقية (موسوعة تبحث في اهم شؤن بلادا و احوالها الطبيعية والاقتصادية والاجتماعية والادارية والثقافية والعمرانية والتأريخية)، الجزء الثاني، مطبعة دجلة، بغداد ١٩٤٧.

٦٠-عبدالرزاق الحسني:
العراق قديماً وحديثاً، طبعةالثالثة،مطبعة عرفان، صيدا-١٩٥٨.

٦١-عبدالوهاب الكيالي:
موسوعة السياسيه، طبعة.الأولى، بيروت-لبنان، مارس - ١٩٧٤.

٦٢-علي كمال:
مذكرات على كمال(تقديم و تحقيق جمال بابان)، بغداد-٢٠٠١.

٦٣-د.فاضل براك:
المدارس اليهوديه والأيرانيه في العراق، طبعة ثانيه، بغداد-١٩٨٥.

٦٤-د.فاضل حسين:
مشكلة الموصل، بغداد-١٩٧٧.

٦٥-فريد اسسرد:
المسألة الكردية بعد قانون ادارة دولة العراقية، سليمانية-٢٠٠٥.

٦٦-كارل بروكلمان:
تأريخ الشعوب الأسلاميه،ت. نبية امين فارس، طبعة الأولى، بيروت. لبنان.

٦٧-كامل صالهيى:
موجز في التأريخ كركوك،كركوك-٢٠٠٥.

٦٨-د.كاوس قفتان:
الأنتفاضات البارزانيه (صفحات من الحركة التحررية الكردية في نصف الاول من قرن العشرين)، مطبعة سركوتن_٢٠٠٢.
٦٩-كركوك مدينة القوميات المتأخيه :
مجموعة من الأكاديميين العراقيين(وقائع الندوة العلمية التي عقدها للبحوث والدراسات في لندن من ٢١-٢٢ تموز(٢٠٠١.م)، طبعة الأولى-٢٠٠٠.
٧٠-كمال مجيد:
النفط والأكراد، طبعة ثانيه، لندن-١٩٩٧.
٧١-كي ليسترنج:
بلدان الخلافه الشرقيه،ت.بشير فرەنسيس، طبعة الأولى، بغداد-١٩٥٤.
٧٢-ليلى نامق جاف:
كركوك لمحيات تأريخيه،(منشورات خبات) اربيل-١٩٩٢.
٧٣-مجرسون:
رحلة متنكر الى بلاد مابين النهرين و كردستان، ت.فؤاد جميل، ج.الأول، طبعة الأولى، بغداد-١٩٧٠.
٧٤-محمد هادى دفتروعبدلله حسن:
العراق الشمالى، جزء الأول، بغداد-١٩٩٦.
٧٥-محمد علي قرداغي: هوية كركوك الثقافية والادارية، دار اراس للطباعة والنشر، طبعة الاولى، اربيل - ٢٠٠٤.

٧٦-نجدة فتحي صفوة:
العـراق في مـذكرات دبلوماسـيين الأجانـب، طبعـة الأولى، بغداد-١٩٨٤.

سێیەم/ سەرچاوەو کتێبەکان بەزمانی ئینگلیزی

77-Gorg Allen: Ancient Iraq, By, Ruskin Housee, Museum Street.

78-Fuad Taher Sadiq:
Abrief History Of Kurdistan, Kurdistan-2002.

79-Williyam Benton & Helen.H. Bentmn:
Encyclopaedia Britannica, 15 Edition, Printed in U.S.A

80-Habibollah Atarodi:
Great Powers Oil And The Kurd In Mosul, Univeresity Press Of America-2003.

81-M.Phillips Price:
Ahistory Of Turky,( from empire to republic), Londan-1955.

82-Martia. Toshea:
Trapped Between The Map An Reali ty, (geography and perception of kurdistan), Rouledge, Newyork, London.

83-S.H. Longrigg:
Oil In The Midle East, London-1954.

**چوارەم/ئەنتەرنێت**

84- www.assyrians of Kirkuk. COM/ school history.

**پێنجەم/سەرچاوەکان بەزمانی تورکی**

٨٥-شمس الدين سامي:

قاموس ئيعلام، استنبول، ١٣٥١هـ-١٨٩٨م.

٨٦-عطا ترزي باشي:

كركوك مطبوعات تاريخي، قسم-١، كركوك-٢٠٠١.

**شەشەم/نامەی ماستەری کوردی( بڵاونەکراوە )**

٨٧-عەلی تەتەر تۆفیق:

ژيانا سياسى لكوردستان، كۆلێجى ئاداب، زانكۆى دهۆك، ٢٠٠٢ز.

٨٨-كامەران محمد جەلال:

نــوزی لەهــەزارەی دووەمــی پــێش زایــن،(توێژینەوەیــەکی مێژوویی سیاسی ئابوریيه)، زانکۆی سلێمانی، ٢٧٠٤ کوردی-٢٠٠٤زاینی.

**حەوتەم/نامەی ماستەری عەرەبی**

٨٩-سعدی عثمان حسين:

كردســـــتان والأمبراطوريـــــة العثمانيـــــه،(دراســـــة في تطورالسياسی١٥١٤-١٨٥١م) جامعة صلاح الدين، اربيل-١٩٩٥.

٩٠-كامران عبدالصمد احمد دوستكی:

كردستان العثمانيه، رسالة ماجستير، جامعة صلاح الدين، اربيل-٢٠٠١.

**هەشتەم/ نامەی دكتۆرای عەرەبی.**

٩١-عبد ربة سكران ابراهيم الوائلی:

اكراد العراق(١٨٥١-١٩١٤ن) (دراسة في التأريخ الأقتصادی والأجتمـــاعی والـــسياسی) كليـــة آداب، جامعـــة قـــاهره-١٤٠٧ه١٩٨٧م.

**نۆيەم/ ليكۆڵينەوەو كتێبە بەڵگە نامەييەكان**

ا-بەكوردی

٩٢-د.وەليد حەمدی:

كوردو كوردستان لە بەڵگەنامەكانی بەريتانيادا، وەرگێڕانی محەمەد نوری تۆفيق، سلێمانی،١٩٩٩.

ب-بەعەرەبی

٩٣-د.كمال مظهراحمد:

كركوك وتوابعها حكم التأريخ والضمير، ج.الأول -مطبعة رينوين، كوردستان.

٩٤-عبدالرقيب يوسف:

حدود كردستان جنوبيه تاريخيا او جغرافيا، طبعة الاولى،سليمانية-٢٠٠٥ .

٩٥-الموصل وكركوك في الوثائق العثمانية، ت،د.خليل علي مراد، سليماني-٢٠٠٥.

٩٦-د.عبدالله محمد العالياوي:

سياسة الدولة العثمانية تجاة العشائر الكردية في كركوك واطرفها من عام ١٨٨٧م حتى عام ١٩٠٩م،(دراسة وثائقيه تحليليه) جامعة صلاح الدين كلية اداب _اربيل.

دەیەم/ گۆڤارەکا ن

ئەحمەد عەزیز:

٩٧-کوردستانییەتی کەرکوك لەئینسایکلۆپیدیای وڵاتانی ئەوروپا و ئەمریکادا، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە(١٦) بەهاری ٢٠٠٣.

٩٨-کوردستانیەتی کەرکوك لەئینسایکلۆپیدیای وڵاتانی ئەوروپایی و عەرەبی و ئەمریکیدا، ، وەرگێرانی لەعەرەبییەوە مەجید سالح، گۆڤاری بانەڕۆژ، ژمارە(١٢) تشرینی ٢٠٠٤.

٩٩-ئەحمەد تاقانە:

بەشێك لە یاداشتی عەونوڵا کازمی، و. لە تورکییەوە: ئەحمەد تاقانە، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە(٤)ی ساڵی پێنجەم.

پ.د ئازاد نەقشبەندی:

١٠٠-کاریگەری نەوتی کەرکوك لەسەر راگوێزانی کورد لەکەرکوك و بەعەرەبکردنی، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە(٢٠)ی هاوینی ٢٠٠١.

١٠١- دەربارەی دەستنیشانکردنی سنوری کوردستان، گۆڤاری سیاسەتی دەولی(گۆڤارێکی وەرزییە سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژ دەری دەکات)، ژمارە(٢)ی ساڵی سێیەم، تەموزی ١٩٩٤.

ئەژی:

١٠٢-مێژووی سەردەمە کارگێڕی و بەڕێوەبەرییەکانی ناوچەی کەرکوك، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە(٤)ی ساڵی دووەم، بەهاری٢٠٠١.

١٠٣- ئەو کۆمەڵەو رێخراووحزبانەی لەناوچەی کەرکوك سەریان هەڵداوە. گۆڤاری کەرکوك، ژمارە(٣)ی ساڵی دووەم، زستانی ٢٠٠١.

١٠٤- ئازاد:

مێژووی دۆزینەوەو دەرهێنانی نەوت لەکەرکوك، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە(١)ی هاوینی ١٩٩٩.

١٠٥- ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر: سەعدی عوسمان حسین، کوردستانی باشور لە سەدەکانی ١٧ و ١٨ دا. گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە ٢٣ بەهاری ٢٠٠٢.

١٠٦- پشتیوان حسێن و کارزان کەریم.

بایەخی جیۆپۆلەتیکی پارێزگای کەرکوك، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە(١)ی ساڵی شەشەم، هاوینی ٢٠٠٤.

د.جمال رەشید:

١٠٧- کەرکوك لەچاخە کۆنەکاندا، گۆڤاری سەنتەری برایەتی ژمارە(٢٠) هاوینی-٢٠٠١.

١٠٨- گیروگرفتی کەرکوك و گەرمیان، (چاوپێکەوتنی گۆڤاری گوێن لەگەڵ د.جمال رشید) ژمارە(٥٢٦) ساڵی پانزەیەم، ٣ی ئاداری ٢٠٠٥.

د.جبار قادر:

١٠٩- التركيب الأثني لسكان كركوك(١٨٥٠-١٩٥٨)، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە(٣)ی ساڵی چوارەم زستانی ٢٠٠٣.

١١٠- السياسات الحكومية بحق الكرد في كركوك خلال العهد الملكي، گۆڤاری کەرکوك ژمارە(١٤) پایزی ٢٠٠٢.

جەلال جەوهەر

١١١-هەشتا ساڵ تەعریب کردنی کوردستان، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە(٤)ی ساڵی ٢٠٠٠.

١١٢-پاکتاوی نەژادی لە کوردستان، گۆڤاری کەرکوك ژمارە ١١، زستانی ٢٠٠٢.

١١٣- جەمیل رۆژبەیانی:

مێژووی تورکمان و تورك لە کوردستانی خوارو، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە(٢٥) هاوینی-٢٠٠٥.

١١٤- د.ج.گەرمیانی:

کەرکوك شاری مێژوو سەربەرزی کوردان. گۆڤاری سەنتەری برایەتی ژمارە(٢٠) هاوین-٢٠٠١.

هاشم عاسی کاکەیی:

١١٥- شارەزوور لەڕوانگەی سێ بابەتی مێژوویدا، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە(٢٢-٢٣)پاییزو زستانی ٢٠٠٤-٢٠٠٥.

١١٦- شەبەك لەنێوان ئاین و نەتەوەدا، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە(١٩) زستانی ٢٠٠٤.

١١٧- وەلید شەریکە:

کەرکوك توێژینەوەیەکی جیۆمێژوویی، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە(٢٠) هاوینی-٢٠٠١.

١١٨- علی محمد سورداشی:

جیۆلۆجیای ناوچەی کەرکوك و کاریگەری لەسەر کۆبوونەوەی نەوت، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە(٢٠)نیسانی٢٠٠١.

١١٩- عمر ابراهیم تۆفیق

الترکمان في العراق(دراسة تأریخیە جغرافیە)گۆڤاری کەرکوك، ژمارە(٢٤) بەهاری ٢٠٠٥.

عبدالرقیب یوسف

١٢٠- العالم الأثریە في مدینە کرکوك، گۆڤاری کەرکوك ژمارە(١)ی ساڵی سێیەم- هاوینی٢٠٠١.

١٢١-چەند بەڵگەنامەیەك لە بارەی هەمەوەندەوە، گۆڤاری هەزار مێرد، ساڵی سێیەم، کانونی یەکەمی ١٩٩٩.

١٢٢- عوسمان كانی پانكەیی:

كـەركوك شـاری مێژووینـەی كوردنـشین. گۆڤـاری بانـەرۆژ، ژمارە(٢٢)ی ئەیلولی ٢٠٠٥.

١٢٣- عوسمان سەید قادر:

كـەركوك شـاری دێرینـی كوردسـتان، گۆڤـاری مرۆڤایـەتی، ژمارە(٧) ئۆكتۆبەری ١٩٩٨.

١٢٤-عەلی مەحمود محەمەد:

كەركوك شاری قەڵاو ئاگرو خوێن، گۆڤاری نەوشـەفەق ژمـارە ٢٤/كانونی دووەمی ٢٠٠٦.

١٢٥-عبدالخالید سابیر:

ویلایــەتی موســڵ لــە ســاڵنامەی عوسمانیــدا، گۆڤــاری هەزارمێرد، ژمارە (٢٦)ی ساڵی هەشتەم.

١٢٦-غازی حەسەن:

یەكـەم چـاپخانەی كوردسـتان لـە كـەركوك بـووە، گۆڤـاری نەوشەفەق، ژمارە (١١)ی شوباتی ٢٠٠٤.

١٢٧- د.كاوس قەفتان.

یاسـای باجگریو دۆخـی ئـابوری ناوچەكوردێكان لەوڵـەتی عوسمـانی لەسـەدەی نـۆزدە هەمـدا، گۆڤـاری رۆشـنبیری نـوێ، ژمارە(١٤٠) ١٩٩٧.

١٢٨- كەمال مەعروف

قەڵای كەركوك لەڕوانگەی شوێنەوارو مێژوودا، گۆڤاری بانـە رۆژ ژمارە(٤)ی ئازاری ٢٠٠٤.

كەیوان ئازاد ئەنوەر:

١٢٩-سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی لە کوردستاندا، گۆڤاری پەیڤین، ژمارە (٧)ی دیسەمبەری ١٩٩٩.

١٣٠-کەرکوك لە مێژووی کۆندا، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە(٢-٣)ی پایزی ١٩٩٩.

د.خەلیل ئیسماعیل:

١٣١-رەهەندی نەتەوەیی نیشتەجێبوونی عەرەب لەپارێزگای کەرکوك، گۆڤاری سەنتەری برایەتی ژمارە(٢٠)ساڵی ٢٠٠١.

١٣٢-دابەشبوونی جوگرافی تورکمان لە عێراقدا، گۆڤاری سیاسەتی دەولی، ژمارە ٤ی ساڵی دووەم، کانونی دووەمی ١٩٩٤.

د.نوری تاڵەبانی:

١٣٣-ویلایەتی موسڵ لەلایەن ئینگلیزەوە لکێنرا بەدەوڵەتی عێراقەوە، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە(٢)ی ساڵی پێنجەم، پایزی٢٠٠٢.

سیاسەتی گۆڕینی واقیعی نەتەوەی کەرکوك لەکۆنەوە تا ئەمەڕۆ، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە(١)ی ساڵی سێیەم هاوینی ٢٠٠١.

١٣٤- رافدە عبدالله قرەداغی

الگوتیون سکان الکردستان القدیمە.. من هم ..واین عاشوا، گۆڤاری هەزار مێرد، ژمارە (١١) ساڵی سێ یەم، ئاداری ٢٠٠٠.

١٣٥- روفائیل میناس:

کەرکوک لەمێژوودا، گۆڤاری ئاران، ژمارە(١٣)ساڵی ٢٠٠٠.

١٣٦- رەفیق ساڵح

رۆژنامەوانی کوردی لەکەرکوک، گۆڤاری هەزار مێرد، ژمارە(١٦)ی حوزەیرانی،٢٠٠١.

١٣٧-ستار مصطفی:

کردستانیة کرکوك حسب ارقام و احصائیات غیر، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە (٤)ی ساڵی شەشەم، بەهاری ٢٠٠٥.

١٣٨-سەرتیپ هەمەوەندی:

دوورخستنەوەی هەمەوەند بۆ تەرابلوسی رۆژئاوا لە ئەفەریقا، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە (٣)ی ساڵی حەوتەم، زستانی ٢٠٠٦.

سمکۆ بەهرۆز محمد:

١٣٩- نەروازەیەکی مێژووییانە بۆ رووداوەکەی ساڵی ١٩٥٩ی شاری کەرکوك، گۆڤاری کەرکوك ژمارە(٢)ی ساڵی پێنجەم.

١٤٠-مێژووی زمانەوانیو گۆڕانە رۆشنبیرییەکانی ناوچەی کەرکوك، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە(١)ی ساڵی پێنجەم، هاوینی- ٢٠٠٣.

١٤١- موعتەسەم ساڵەیی:

کێشەو مێژووی شاری کەرکوك، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە(٢١)ی هاینی ٢٠٠٤.

١٤٢- قادر محمد:

ناوچەی کەرکوك لەسەردەمی عەبباسییەکاندا گۆڤاری سەنتەری برایەتی ژمارە(٢٠) ساڵی ٢٠٠١.

١٤٣- فەرید ئەسەسەرد:

(نوسنێك لەبارەی گۆڤاری دۆسییەی تورکیا وەك پێشەکی)، گۆڤاری دۆسییەی تورکیا ژمارە(١)ی مایسی ٢٠٠٥.



پاشکۆی ژمارە (١)

نەخشەو پێگەی ڕاستەقینەی کوردستان: گۆڤاری خاك ژمارە (٩٢)ی

ساڵی هەشتەم، ١٠/شوبات/٢٠٠٥



**پاشكۆى ژمارە ( ٢ )**

**نەخشەو پێگەى راستەڤینەى كوردستان: گۆڤارى خاك ژمارە ( ٩٢ )ى**

**سالى هەشتەم، ١٠/شوبات/٢٠٠٥**

# سوپاس و پێزانین

١. سوپاس و پێزانینی خۆم ئاراستەی بەڕێز (م.سەلاح کانەبی) دەکەم لەم بەرهەمەدا وەکو سەرپەرشتیارو ئەرك و ماندووبوونی ئەو لەم کارەدا بەرز دەنرخێنم.

٢. سوپاسی بەڕێز (م. پشکۆ) دەکەم کە لەڕێگەی پێدانی چەند سەرچاوەی بەکەڵکەوە هاوکاری کردم.

٣. سوپاسی بەڕێز (د.عەبدوڵڵا ئالیاوەیی) دەکەم کە لەڕێگەی چەند بەڵگەنامەیەکەوە هاوکاری کردم.

٤. سوپاسی بەڕێز (کاك سۆران عەبدوڵڵا) دەکەم لەئەرك و ماندوو بوونی لەکاتی ئامادەکردنی ئەم بەرهەمەدا.

٥. سوپاس و پێزانینی خۆم ئاراستەی مەکتەبی بیرهۆشیای (ی.ن.ك) دەکەم کە ئەرکی لەچاپدانی ئەم کتێبەیان گرتە ئەستۆی خۆیان.

٦. سوپاس و پێزانینی خۆم ئاراستەی سەرجەم کارمەندانی ئەم کتێبخانانەی لای خوارەوە دەکەم:

ا. کتێبخانەی کۆلیجی زانستە مرۆڤایەتییەکان لەزانکۆی سلێمانی.

ب. کتێبخانەی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان بە تایبەتی ئاواز خان. ج. کتێبخانەی گشتی کەرکوك.

٧. بەپێوستی دەزانم سوپاسی خۆم ئاراستەی سەرجەم سەرنج و تێبینیەکانی بەڕێزان م. هیوا عەزیز سەعیدو م.رافیدە عەبدوڵڵا بکەم.